بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه ومن والاه . وأشهد أن لا إلــه إلا الله وأشـــهد أن محمدا عبده ورسوله .

***خوێنەری ئازیز ...***

گـــەورەترین و بـــەنرخترین ســـەرمایەی موســـڵمان کەپێویستە پارێزگاری لێ بکات بیرو باوەڕەکەیـەتی . بۆیـە زۆر زیاتر لەئەندامەکانی لەشی پێویستە چاودێری بکـات و کارێـك نـەکات بـە ووتـە یـان کـردەوە یـان بـیرو باوەڕێـك بناغەی ئیمانی خۆی بدۆڕێنێ .

سەنگین ترین لقی بیرو بـاوەڕیش بریتیـیە لـە خـۆش ویستن و دۆستایەتی کردنی مسوڵمانان و خۆبەری کـردن و ڕق لێ بوونەوەیــە لــە بــێ بڕوایــان کــە لــەم ڕۆژەدا زۆر موسڵمان دەبینی گوێ نادات بەم لایەنە و بگرە پێشی وایە کە سیاسەت و حیکمەت وادەخوازێ ! کە خۆت لەبـەردەم بێ بڕواياندا وانیشان بدەیت تا هەڵبخەڵەتێن !!

نا.. براكـەم خـراپ تـێ گەيەنـدراوى . ئـەو كۆمەڵـەى پێغەمبــەرى خــواش (ﷺ) پــەروەردەى كــردن وابيريــان نــەدەكردەوە . ئيــسلام دينىئاسمانىيــە بــەهيچ جۆرێـك قبوڵى هەواو ئارەزووى دەست تێوەردانى من و تۆ ناكات.

كابرايەكى درومان هاتـە لاى شێخ (**حـسن بـصرى**) و پرسى : من كابرايەكم جل و بەرگى ئەو كەسـانە دەردوورم كەستەم كارو بێ بڕوان ئايا من بەر ئـەم ئايەتـە دەكـەوم و لــەو كەســانەم كــە مــەيلم نــەداوە بــەلاى كافرانــدا : ﴿ ولاتركنوا إلى الذين ظلموا فتمسكم النار.﴾ (هود: ١١٣) .. شـێخ حـسن ڕەحمـەتى خـواى لێ بـێ وەك قوتابيـەكى هاوەڵان.. وەك تابيعىيـەك كەلـە چـاكترين سـەردەم دايـە فەرمووى : نەخێر .. تۆ مەيلت نداوە بەلاى ستـەم گارانـدا .. بەڵكو خۆت ستەم كارى ! ئەو كەسـەى پێويـستيەكانت بــۆ دێنــێ مــەيلى داوە بەلايانــدا : ســبحان الله .. لــەم تێگەيشتنەو لەم عەقيـدە عەصـريەى تـريش كـە كۆمـەڵێك دروستى كردووەلەم ڕۆژەدا.

لەبەر ئەمە كاتێـك ئـەم ناميلكـە وەرگێـردراوەم بينـى زۆر شـادمان بـوم كەبرايـەكى ئـاوا دڵـسۆز بـەجۆرێ نـاوى

خۆی نەداوە بنوسرێ لەسەر ئەم بابەتە وەرگێڕدراوە .
هەڵسێ بەتیمارکردنی ئەم زامە سەختەی کە مسوڵمانانی گرتۆتەوە . بەجۆرێ زۆر قوتابی و شاگردی ئەو مامۆستا بەناو ئیسلامی یانەش دەروێش ئاسا (أشهد) دەکەن بۆ ئەم فەرمانانەی کە فێریان دەکەن تا خۆش ویستن و ڕق لێ بونیان لەسەر لایەنی حیزبی‌و سیاسی و دنیایی بێ نەك لەبەرخوا ، پاشان بەپێی شەرعی خوا بێ .

ئومێدەوارم خوای گەورە پاداشتی چاکی ئەو برایە و هەموو ئەو کەسانە بداتەوە کە لەچاپ کردنی ئەم نامیلکەدا ئەرکیان کێشاوە .

لەخوا دەپارێمەوە کە مسوڵمانان جارێکی تر بگەرێنێتەوە سەر ئەو چاوگەیەی کەپێشینی ئەم ئومەتەی لێ تێر ئاو کردوەکو ئەوان مامەڵە لەگەڵ دۆست و دوژمنانی دیندا بکەین تا دنیامان ڕازاوەو قیامەتمان گەشاوە بێت.

وماذلك على الله بعزيز

والسلام عليكم

حەمزە بەرزنجی ١٤١٩ی کۆچی

## بەشی یەکەم:

# واتــای لایەنگیری و بەری بوون

***پێناسەو گرنگیەتی لەقورئان و سونەتدا :***

١) لــەڕووی زمانەوانیـیــەوە: **(لایــەنگیری)** : لــەزۆر کتێبی زمانەوانی داهاتوو کە واتاکەی ئەوەیە کە دوو کەس شەڕیان ببێت و یەکێك بچێتە نێوانیانەوە و ڕێکیان بخات و شەڕنەکەن بەڵام ئەو کەسە ئەگەر لایەنی یەکێکیان بگرێـت بەمە دەوترێت (لایەنگیری) . ووشەی (مولی) واتە لایەنگر ، زۆر واتای تری هەیە لەزمانی عەرەبیدا ، وەك :

(خوا ، خاوەن ماڵ ، گەورە پیاو ، بەخـشندە، ڕزگـار کەر ، سـەرخەر، دواکـەوتوویی، یـەکێك ، ئـامۆزا ، سـوێند خۆر ) وەزۆر واتای تریش.

وەهــەروەها(ولی) پێـچەوانەی (عــدو) واتــە لایــەنگیر پێچەوانەی دوژمـن و بـێ بـەری یـە. وەکەسێك لایـەنگیری یەکێکی تر بکات بەقسەی دەکـات لـە فرمانـەکانی داو مـل کەچە بۆی.

بەری بوون: بەوکەسە دەوترێت کەلە یـەکێك یان

شتێك رزگاری ببێ لیێی دوور بكەوێتەوە و خۆی لێ پاك بكاتەوە. وەهەروەها بەو كەسە دەوترێت كەبەهانەی نەمێنێ و چونكە ئاگادار كراوەتەوە ، وەك خوای گەورە لەقورئاندا دەفەرموێ : ﴿ برآءة من الله ورسوله إلى الذين عاهدتم من المشركين ﴾ (التوبة) واته: (أعذر وأنذر) .

٢) لەرووی زاراوەوە: **(لایەنگیری)** : بریتیەیە لەسەر خستن و خۆشەویستی و بەخشندەییو رێزو لایەنگیری بەئاشكراو نهێنی خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ الله ولي الذين آمنوا يخرجهم من الظلمات إلى النور والذين كفروا أولياؤهم الطاغوت يخرجونهم من النورإلى الظلمات أولئك أصحاب النار هم فيها خالدون ﴾ (البقره:٢٥٧)..واتە: (خوا سەرخەرو لایەنگیری باوەڕدارانە لەتاریكیەیەوە دەیانبات بۆ رووناكی بەڵام بێ بڕوایان لایەنگیری یان طاغوتە لەرووناكیەیەوە دەیانبات بۆ تاریكی) مانای طاغوت ئەو كەسەیە كە بپەرسترێ جگە لەخوا وەخۆشی پێی ڕازی بێ.

كەواتە لایەنگیری بێ بڕوایان مانای نزیك بوونەوەیە لیێیان و دەرخستنی خۆشەویستیەیە بۆیان بەقسەو كردەوە و نیەت (كتاب الإيمان _ نعيم ياسين )لا(١٤٥).

بێ لایەن (بەری بوون) واتە: دوورکەوتنەوە و ڕزگار بوون و دوژمنایەتی بەهانە نەمان و ئاگادار کردنەوە .

ڕوون کردنەوەی ئەم پێناسەیە : (**شێخ الأسلام أبن تیمیة**) فەرموویەتی: لایەنگیری دژی دوژمنایەتییە وەبنچینەی لایەنگیری خۆشەویستی ونزیك بونەوەیە . وەبنچینەی دوژمنایەتی ڕق و کینەو دوورکەوتنەوەیە. وەلایەنگیر واتە نزیك وەك دەڵێن: (هذا یلي هذا) ئەمەش لەدوای ئەوەوە دێت واتە نزیکە لێوەی .

وەئەگەر لایەنگیری خوا بریتی بێت لەدواکەوتنی و ڕێکەوتن لەگەڵیدا لەوشتانەی کە خۆشی دەوێت و ڕەزامەندی لەسەریەتی یان ئەوانەی کەڕقی لێ یەتی و پێی ناخۆشە وەیان دژی دەوەستێ کەواتە دوژمنایەتی لایەنگیری خوا دوژمنایەتی خوایە وەك خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿ یاأیها الذین آمنوا لاتتخذوا عدوي وعدوکم أولیاء تلقون إلیهم بالمودة ﴾ ( الممتحنة: ١ ) واتە: ( ئەی بڕواداران دوژمنی من و پاشان خۆتان مەکەن بەلایەنگیری خۆتان و خۆشتان بوێت )واتە ئەو کەسەی دوژمنایەتی لایەنگیری خوای کرد ئەوا دوژمنایەتی خوای کردوە.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((من عادی لي وليا فقد بارزنی بالمحاربة)) (البخاری ٣٤٣/١١)..واتە: (ئەوەی دوژمنایەتی لایەنگیرێکی من بکات وەك ئەوە وایە کەبەشەڕ زۆرانبازیم لەگەڵ بکات).

وە حوکمی زاراوەی (لایەنگیری دوژمنانی خوا) ئەکەوێتە چەند بەشێکی جیاوازەوە لەوانە هەڵگەڕانەوە و کافر بوونە ، وەهەندێکی تریان گوناهە گەورەکانە یان حەرامە. وەکاتێك خوا ئەم پەیوەندی‌یانەی بەست لەگەڵ بڕواداراندا(برایەتی و خۆشەویستی و لایەنگیری و سەرخستنی یەکتری) وەدژی لایەنگیری بێ بڕوایان وەستا لەجولەکەو گاورو بێ بڕوایان بەخواو موشریکەکان ، ئەوا لەو بنەچانەی کە مسوڵمانان لەسەری ڕێکەوتن بریتی بوو لەوەی کە هەریەکتاپەرستێك وازی لەهەموو بێ بڕوایی‌یەك هێنابێ ئەوا پێویستە کە خۆشمان بوێ لایەنگیری بکەین و سەرخەری بین .

وەئەوەی دژی ئەمانەبو ئەوا پێویستە خۆمان لەخوا نزیك بکەینەوە بەوەی کە کینەو ڕقمان لێ بێو دوژمنایەتی بکەین وە بەرەنگاری ببینەوە بەقسەو

بەکردەوە بە پێی توانا . وەلەبەر ئـەوەی کەلایـەنگیری و بێ بەری بوون پەیوەستن بە خۆشەویستی و ڕقەوە کەواتە بناغـەی بـڕوا ئەوەیـە کـە لـەپێناوی خـوادا پێغەمبـەران و شوێن کەوتوانیت خۆش بوێت وەلەپێناوی خوادا دوژمنانی و دوژمنـانی پێغەمبـەرانی وشـوێن کـەوتوانیت ڕق لێ بـێ (الفتاوى السعدية ١/٩٨).

وەهـەروەها (إبـن عبـاس) ڕەزای خـوای لـێ بێـت دەفەرموێ: (هەرکەسێك یەکێکی خۆش ویست لەبەر خوا و ڕقی لێی بوو لەبەر خوا وەهەروەها دوژمنایەتی کرد لەبەر خوا و لایەنگیری کرد لەبەرخوا کەواتـە بـەمانای لایـەنگیری خـوا بەدەسـت دێنـێ ، وەهـیچ بەندەیـەك لـەزەتیئیمان ناکات هەرچـەندە نوێـژو ڕۆژوو شـی زۆر بێت تـاوەکو بـەو شـێوەیە نـەبێت ، وەبرایـەتی خـەڵکی بەگـشتی لەسـەر کاروبـاری دنیـا یـە وەئەمـەش سـودێکی وا ناگەیـەنێ بەخاوەنەکەی) (حلية الأولياء ١/ ٣١٢ إبن عباس)، بەڵام ئەگـەر پێشڕەو زانای ئەم ئوممەتە بڵـێ برایـەتی خـەڵکی لـەکاتی خۆیـدا لەسـەر کاروبـاری دنیـا بووبێـت کـە ئەمـەش سـود بەخاوەنەکـــەی ناگەیـــەنێت ، وەئەمـــە لەســـەردەمی

پێغەمبــەردابووە(ﷺ) کەباشــترین ســەدەیە، کەواتــە پێویستە لەسەر مسوڵمانان کەووشیار بێتـەوەو بزانـێ کـە کێ ی خۆش دەوێ ورقی لەکێیە وەلایەنگیری کـێ دەکـاو دوژمنایەتی کێدەکا ، دوایئەوە خۆی بکێشێ بەتەرازووی قورئـان و سـوونەت بـۆ ئـەوەی کـە ببینـێ ئایـا لـەریزی شــەیتان و حیزبەکــەی وەســتاوەیان لــەریزی بەنــدەکانی خوایە و لەحیزبی خوادایە کە هەرئـەوان سـەرکەوتوون زوە جگە لەوان ئەوانەن کە ئەم دنیاو ئەو دنیاشیان چووە.

وەئەگەر بێتوو ئەم برایەتییە لەسـەر کاروبـاری دنیـا پێـك هاتبـێ ئـەوا ئەوەنـدە ناخایـەنێ و تێـك دەچـێ ئـەو کاتــەش هــیچ شــتێك نابێتــە پارێزگــاری ئــەم ئوممەتــە . وەئومــەتی ئیــسلام بــەهیچ شــێوەیەك ڕاســت نابێتــەوە جارێکی تر تـاوەکو نەگەڕێتـەوە بـۆ لای بەرنامەکـەی خـوا وەکۆ بوونەوە لەسەر خۆشەویستی خـواو پێغەمبەرەکـەی ئەوکاتە مسوڵمانان دڵخۆش دەبن بەم سەرکەوتنە لەلایـەن حواوە .

# بیروباوەڕی ئەهلی سوونەت وجەماعەت لەلایەنگیری و بەری بووندا

پێویستە کەباسی بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەت بکەین لەم بوارەدا بۆ ئەوەی بەمە بتوانین سەرکردەی داهێنراوەکانی دین و ئارەزوو بازەکان بناسین کەهیچ پشت بەست نین بەبەڵگەی قورئان و سوننەت **(شیخ الإسلام) أبن تیمیة** (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێ : ( پێویستە لەسەر باوەڕدار کەدوژمنایەتی لەبەر خوا بکات وەلایەنگیری لەبەر خوا بکات . بەلاّم ئەگەر بڕوادارێك هەبێ لەهەر شوێنێکی جیهاندا بێت وەستەمیشی لێ کردبێت دەبێ لایەنگیری بکەین چونکە ستەم لایەنگیری بڕوادار نابڕێت. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وإن طائفتان من المؤمنين اقتتلوا فأصلحوا بينهما... ﴾ (الحجرات: ٩).

بەم شێوەیە پەروەردگار هەموویانی بەبرای یەکتر داناوە ئەگەر بێتو شەڕو ناخۆشیش بکەوێتە نێوانیانەوە) ئەوە فەرمانی داوە بەچاکبوونیان کەواتە بابڕوادار پەند وەربگرێت وەبزانێت کە پێویستە بڕوادار لایەنگیری بکرێت

ئەگـەر کـەم وکورتیـشی هـەبێت، وەبـێ بـڕوا پێویـستە دوژمنایەتی بکرێت ئەگەر بەخشندەو چاکەشی هەبێت. پـەروەردگار کەپـەیامی بـە پێغەمبـەرانی دا نـاردووە بـۆ ئەوەی کە دین و یاسا و بەرنامەی خوایی بڵاو بکەنـەوە و خۆشەویـستی یـان هـەبێ بەرامبـەر بـە لایـەنگرانی خـوا وەڕقیان لەدوژمنانی بێ.

بەڵام ئەگەر پیاوێك خێرو شـەڕو سوننەت و بیدعـەی تیاکۆبۆوە ، ئەوا شایەنی ئەوەیە کە لایەنگری بیت بەپێی چاکەکەی وەدوژمنی بیت بەپێی خراپیەکەی وەك چۆن پیاوێکی دز کەدەستی دەبڕن بەڵام لەخەزێنەی دەوڵەتیش بەشـی دەدرێ بـەپێی پێویـستی ژیـانی ، وە ئەمەیـە کـە ئەهلی سوونەت و جەماعەت کە لەسەری رێکەوتوون بـەڵام (خـوارج و معتزلـة) ..﴿ **فتربصوا حتى يأتي الله بأمره والله لايهدي القوم الفاسـقين** ﴾ ( التوبـة: ٢٣-٢٤) وەهـەروەها (**شیخ الأسلام**) **إبن تيمية** بەکورتی ئەوباسە لێك دەداتەوە لەکۆتایی باسەکەیدا دەڵێ: ( باوەڕدار پێویستە لایـەنگیری بکـرێ وە بـێ بـاوەڕ دەبـێ بـەری بـین لێـی و دوژمنایەتیبکـەین ئەگـەر هەرکەسـێك بێـت ، وە ئـەوەی بەشـێکی بـاوەڕو بەشـێکی بـێ بـاوەڕی تێـدابێت ئـەوا

لایــەنگیری دەکــرێ بــە پــێی باوەڕەکــەی وەدوژمنایــەتی دەکرێ بەپێی بێ باوەڕی‌یەکەی چونکە ئـەو کەسـە بـەم گوناهانـە لـەباوەڕ بـەخوا دەرناچـن وەك : (زینـاو عـارەق خواردنەوەو ...) خوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿ إنما وليكم الله والذين آمنوا الذين يقيمون الصلاة ويؤتون الزكـــاة وهم راكعون ومن يتول الله ورسوله والذين آمنوافـــإن حزب الله هم الغالبون ﴾ (المائدة: ٥٥-٥٦) وە دەفـەرموێ : ﴿ ياأيها الذين آمنوا لاتتخذوا اليهود والنصارى أولياء بعضهم أوليـــاء بعـــض ...﴾ ( التوبـە: ٧١) وەهـەروەها دەفـەرموێ : ﴿ والمؤمنون والمؤمنات بعـــضهم أوليـــاء بعض..﴾ وەدەفـەرموێ: ﴿ وإن طائفتان مـــن المـــؤمنين اقتتلوا فأصلحوا بينهما.. ﴾ ... ﴿ إنما المؤمنون إخوة ﴾ (الحجرات :٩) وەهەر لەبەر ئەمەشە کەپێـشین و پێـشڕەوانی ئیـسلام لەگـەڵ شـەڕدا لایـەنگیری یـەکتریان نـەدەکرد لـە دوولایـــەنی شـــەڕەکە وە هـــەموو هـــەڵس و کـــەوتێکی مـــسوڵمانانەیان لەگـــەڵ یـــەکتردا دەکـــرد هـــەوڵی ئاشـــت بوونەوەیان دەدا لە نێوانیاندا وە مامەڵەی بازرگانی‌و ژن و ژن خوازی یان لەگەڵ یەکتردا دەکرد وەبـەهیچ شـێوەیەك دوژمنایەتیان نەدەکردن وەك کافرەکان.

# لایەنگیری و بەری بوون لەدڵدا

لایەنگیری خۆشەویستیو بێ بەری بوون دەگونجێ لەدڵدا بێت ئەگەر ئەو کەسە نەتوانێ بەکردەوە بیچەسپێنێ وەك (**شيخ الأسلام إبن تيمية**) دەفەرموێ: خۆشەویستی و ڕق و کینەو توانایی دڵ دەبێ هەموویان چەسپاوبن لەدڵدا وەنابێ هیچ ناگوزورویەکی تێدابێت مەگەر بەکەم بوونی باوەڕ بەڵام چەسپاندنی بەپێی توانای ئەو کەسەدەبێت ،وەهەرکاتێلایەنگیری و بەری بوون لەدڵدا تەوتو دەبێ وە ئەو کەسە بەپێی توانای خۆی چەسپاندی ئەوا پاداشتی تەواوی خۆی وەردەگرێ ، بەڵام هەندێ کەس هەیە خۆشەویستی وڕق لێ بوونیان بەپێی خۆشەویستی وڕقی خۆیانە نەك بەپێی خۆشەویستی و ڕق لێ بوونیانە لەخواو پێغەمبە (ﷺ) . وەئەمیش جۆرێکە لە ئارەزوو وەئەو کەسەی کەدوای بکەوێ دوای هەواو ئارەزووی خۆی کەوتووە ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ ومن أضل ممن اتبع هواه بغير هدى من الله.. ﴾ (القصص: ٥٠)

## هەڵوێستی ئەهلی سوننەت وجەماعەت بەرامبەرخاوەن داهێنراو وئارەزووەکان

بـەری بـوون لەداهێنــەرەکانی دیـن و ئــارەزوو بازەکـان دەچـێتە نـاو بیرِوبـاوەری شـوێن کـەوتوانی سـوونەت و جەماعەت وە (بدعـة) واتـە داهێنـراو مانـای ئەوشـتەیە کـە لەوەپێش نەبووبیٚ وەتازە درووست بوبێت وەنەبینرابێت و بۆ یەکەم جاربێت.

وەك چـۆن خـوای گـەورە دەفـەرمویٚ : ﴿ بـــــديع السموات والأرض ﴾ (البقرة:١١٧) وەدەفـەرمویٚ : ﴿ قل ماكنت بدعا من الرسل ﴾ (الأحقاف:٩)... واتە : (بلّیٚ مـن یەکـەم پێغەمبـەر نـیم لەسـەر زەوی دا) وە(إبـن الجـوزی) دەفەرمویٚ : (داهێنراو بریتیـیە لەکردەوەیەك یان قسەیەك بکرێـت لـەوە پـێش نـەبووبیٚ وەبـە زۆری داهێنراوەکـان دژایـەتی شـەریعەتی ئیـسلام دەکـات بەسـەر پێـچی کـردن بەزیاد کردن یان کەم کردنی.)

*وەهەندێك ئەڵێن : ( باشە ئێمە حەقمان چیـیە بەسەر*

*خاوەن داهێنراوەکانەوە کەباسەکەمان بریتی بێت لە لایەنگیری و بێ بەری بوون ؟)*

وەلامی ئەوەش بریتیە لە: هەرچەندە تۆزێك دوورو درێژە بەڵام پێویستە ڕوون بکرێتەوە.

**یەکەم:** داهێنراو لەدیندا مەترسیەکی زۆر گەورەی هەیە وەبەڵگەش بۆ ئەوەی داهێنراو دەکرێت بەچەند پلەیەکی جیاوازەوە لە نێوان بێ باوەڕی و دەرچوون لەدین و گوناهی گەورەوە و گوناهی بچووك.

وە لەم بوارەدا ئیمامی (**شاطیبی**) دەفەرموێ : (داهێنراو دەکرێت بەچەند پلەیەکی جیاوازەوە هەندێکیان بەئاشکرا کوفرەو بێ باوەڕی یە وەك ئەوانەی کەلەپێش ئیسلام دا هەبووە، وەهەروەها داهێنراوی دوو ڕوەکان (المنافقون) ئەوانەی کەدینی ئیسلامیان کردوە بەدار دەستی خۆیان بۆ پاراستنی خۆیان و ماڵو سامانیان وەزۆری تریش وەك حەلاڵ کردنی حەرام و حەرام کردنی حەلاڵ وەهەرکەسێك ئەمانە بکات ئەوا خۆی بەخوا داناوە چونکە ئەمانە هەر شایەنی خوایەو کەسی تر ئەوەی بۆ نیە ، وەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ الا له الخلق

والأمــــر ﴾ (الأعـراف: ٥٤) وەدەفـەرموێ : ﴿ ولاتقولـــوا لماتصف ألسنتكم الكذب ﴾ (النحـل:١١٦) وەخـاوەنی ئـەم داهێنراوە دینییانە پێویستە لەسەر ئێمـە کـە دوژمنایـەتی بکــەین و شـــەڕ لەگــەڵ کردنیــان دوای نــەمانی بەهانــەو ئاگادارکردنــەوەیان ، وەبــێ بــەری بــوون لێیــان هــیچ جیاوازیەکی نییە لە بەری بوون لـەو بـێ بـاوەڕەی کەهـەر لەبنچینەوە باوەڕی بەخوا و بەپێغەمبـەر ەکـەی نـەهێناوە وەك چۆن پێغەمبە(ﷺ) فەرموویـەتی : ((مـن أحـدث في أمرنا هذا ماليس فيـه فهـو رد)) [(صـحيح البخـاری فـی الـصلح ٥/ ٣٠١ح ٢٦٩٧ وصحيح مسلم في الأقضية ٣/ ١٣٤٣ حديث ١٧١٨ )] ... واتـە: ئـەوەی داهێنراوێـك یـان تـازە گەریـەك لـەم دینـەی ئێمەدا بکات کەتیایدا نەبێت ئـەوا مـسوڵمانان نابێـت لێـی وەربگرن .

وە(**البغـوی**) دەفـەرموێ: (هـەموو زانایـانی سـوننەت ڕێکــەوتوون لەســەر دژایــەتی خــاوەن داهێنراوەکــان و ، وەدابڕان لێیان ) [شرح السنة (١/٢٢٧)].

وەئێستاش دەگەرێینەوە بۆ پلەکانی داهێنراو( بدعـة) وەك چۆن ئیمامی (**شاطيبى**) باسی کردووه و دەفەرموێ : (هەندێ لەداهێنراوەکان هەیە کەسەرپێچی یە بـەڵام کـوفر نىیـە، یـان ڕای زانایـان جیـاوازە تێیـدا کەهەنـدێك دەڵـێن کوفرە و هەندێك دەڵێن کوفر نىیەوەك بیدعەی خەواریج و قەدەریەو مەرجیئەو ئەوانەی لـەوان دەچـن لەوانـەی لـەڕێ دەرچوون. وەهەندێك سەرپێـچی تـر هەیـە کـەڕای زانایـان وایە کە کـوفر نىیـە وەك داهێنـراوی(التبتـل) واتـە دابـڕان لەخەڵکی وەدنیا بۆ عیبادەتی خوا (مختار الصحاح/ ص٥٣) .

وەڕۆژوو گرتن لەبەر هەتاو لەگەڵ بـوونی سـێبەردا وە خۆخەسـاندنی بەمەبەسـتی نەهێـشتنی ئـارەزووی جـووت بوون . وەهەندێکی تریان هەن کـە (مکـروه) ن واتـە بـاش نـین و کردەویـەکی ناشـرینە وەك کۆبوونـەوە لەعیـشای شەوی عەرەفەدا بەمەبەستی پاڕانەوە بەکۆمەڵ ، هەروەها ناوهێنـانی دەسـەڵاتداری دەوڵـەت لـەووتاری جومعـەدا ، وەزۆری تـریش هــەن (الأعتـصام ٢/٣٧) وەشـوێن کـەوتوانی

سوونნەت و جەماعەت بەرین لەگەورە پیاوانی بیدعەو تازەگەریەکان .

**دووەم:** لەبەر مەترسی داهێنراوەکان لەسەر دین لێرەدا چەند نموونەیەك دێنمەوە لە ووتەی پێشرەوانی ئوومەتی ئیسلام بۆ ئاگاداربوون لەداهێنراوەکان و داهێنەرەکانیان . وەك یەکێك لەیارە بەرزەکانی پێغەمبەر (ﷺ) کە(عبد الله کوڕی مسعود)ە ڕەزای خوای لێبێ دەفەرموێ: (ئەوەی کە دەیەوێ لەسەر سوونნەت بڕوا ئەوا با چاو لەوانە بکات کە مردون ئەوان یارەکانی (محمد) (ﷺ) بوون وە باشترین کەسی ئەم ئوممەتە بوون وەدڵیان بەترسی خوا ئاوەدان بوو لەهەمووان زاناتر بوون لەدنیا دا، کۆمەلێك بوون خوا هەڵی بژاردبوون بۆ باوەڕیپێغەمبەرەکەی(ﷺ) وە بۆ بڵاو کردنەوەی ئیسلام وە ئێوەش چاو لەخوڕەوشت و ڕێگای ئەوان بکەن چونکە ئەوان لەسەر ڕێگەی ڕاست بوون) (شرح السنة للبغوی ١/٢١٤) وەهەروەها (**سفیان الثوری**) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: (داهێنراو خۆشەویست ترە

لەگوناهلـەلای ئیبلـیس چـونکە گونـاه تۆبـەی لێ دەکرێـت بەڵام داهێنراو تۆبەی لێ ناکرێت)(شرح السنة ١/٢١٦) وەئیمامی مالیـك ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت دەفـەرموێ (هەرکەسـێك تازەگەری‌یـەك بکـات لەدینـدا بەمـە پێـشینەکانی ئیـسلام لەسەری نەبوون ئەوا وەك ئەوە وایە بڵێ پێغەمبەر (ﷺ) خیانەتی کردوە لەبڵاوکردنـەوەی دینەکـەدا چـونکە خـوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ اليوم أكملـت لكـم ديـنكم ﴾ ( المائدة:٣) واتـە: ئـەوەی ئـەو کاتـە دیـن نـەبوو بێـت ئـەوا ئێستا دین نی‌یە) (الأعتصام ٢/٥٣).

وەئیمـامی (**شـاطیبی**) ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت خراپی‌یـەکانی داهێنـراوی (بدعـة) لـە دووبـەش کۆکردۆتەوە(ألأعتصام ٢/٦١).

١-دژی ئـەو کەسـەیە کـە شـەریعەتی دانـاوەو دەیـەوێ شتێکی زیاد لەدین و شەریعەت زیاد بکات یـان کـەمی بکـات وە بـەهیچ شـێوەیەك ڕازی نی‌یـە بەوەی‌کەلەشەریعەتدا بۆی دانراوە.

٢- هەموو داهێنراوێك هەر چەندە زیاد بكرێت یان كەم بكرێت یان هەر لەبناغەوە بیگۆڕێت ئەوا ئەو كەسە كافرەو بێ باوەڕە، وە ئەمانە دەگونجێ بەتەنها بێت یان بەشێك بێت لەیەكێك لە شەریعەتەكانی دین.

وەئەم تێڕوانینە بۆ داهێنراوەكان هەموو بەڵگەكانی خراپ تێڕوانینی و زەم كردنی دەگرێتەوە . لەوانە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ : (كل بدعة ضلالة)واتە هەموو داهێنراوێك گومراییە وەدەفەرموێ : ((من دعا إلى ضلالة كان عليه من الأثم مثل أثام من تبعه لاينقص ذلك من آثامهم شيئا)) [صحيح مسلم (٢٠٦٠/٤) حديث (٢٦٧٤)] .. واتە : ئەوەی بانگەواز بكات بۆ گومڕایی یەك ئەوا ئەوانەی شوێنی دەكەون چەند گوناهیان دەگات ئەوا ئەویش هەمان گوناهی دەگات وە لە گوناهی ئەوانیش كەم نابێتەوە . كەواتە كورتەی بیروباوەڕی ئەهلی سوونەت و جەماعەت بەری بوونە لەوانەی كە داهێنراوی دینی دادەهێنن بەتایبەتی ئەوانەی كە مسوڵمانی پێ كافر دەبێ .

# شێوەکانی لایەنگیری و ڕووالەتەکانی

کۆکردنـــەوەی شـێوەکانی لایـــەنگیری و ڕواڵەتـــەکانی لەیەك بەشـی سـەربەخۆ دا بایـەخێکی تایبـەتی هەیـە لـەم باسەدا، وە بۆ ئەوەی ڕوون بێتەوە لەبەر چاوی خوێنەری ئازیز.

وە حەز ئەکەم لێرەدا ئاماژە بـۆ ئـەوە بکـەم کـە مـن لـەم بـوارەدا زۆر خـۆم نەبەسـتۆتەوە بـەحوکمی شـەرعی یـەوە لەهـەموو پلـەکانی لایـەنگیری بـێ لایـەنی دا چـونکە پلـــەکانی لایـــەنگیری هەنـــدێکیان هـــەن کـــە مـــسوڵمان لەئیسلامەتی دەردەکەن وە هەنـدێکیان بـەگوناهی گـەورە لەقەڵەم دەدرێن و حەرامن . وە دینی ئیسلام سـوور بـووە لەسـەر دڵـسۆزی لەعیبادەتـدا ئـەویش بریتیـیـە لـە بـەجێ هێنانی فەرمانەکانیو مل کەچ کردن بۆ خوای تاك و تـەنها وە بـــەری بـــوون لەهـــەر شـــوێن کەوتوویـــەك و هـــەر ترسناکییەك بێت وە دڵ بەستن بەخوای خۆیانەوە لەترس و داواکردن و پیشتوانی و سەرکەوتندا ، چـونکە هەرکـەس دڵـی بەیـەکێك لەدروسـترکراوەکانی خـواوە بەنـدبێت ئـەوا ئەسیری ئەوەو هەرئـەویش دەپەرسـتێ ئەمـەش ئەوپـەری بێ دەسەڵاتی و زەلیلی و ئەسیریە.

وەمەترسی لایەنگیری کافرو بێ بڕواکان لەوەدا دەردەکەوێ کە زۆر زیاتر لەسەر مسوڵمانان وەك ئەوەی کە یەکێك لەدڵی خۆیدا کوفر بکات چونکە ئەم لایەنگیریە زۆر زیان بەمسوڵمانان دەگەیەنێ وەك لەوەی کەبیروباوەڕیان بگۆڕێت . وەهەندێ کەس لایەنگیری کافرەکان دەکەن سەرەڕای ئەم کردەوەیەشیان خۆیان بەخاوەن بیروباوەڕی تەواو دادەنێت ، دەبا دڵنیا بن لەوەی کە درۆزنن لەلای خواو پێغەمبەرەکەی(ﷺ) و مسوڵمانانیش .وە ئاشکرایە کە لایەنگیری کافرەکان زۆر مەترسی زیاترە لەگۆڕینی بیروباوەر .

## وەئێستاش تۆو شێوەکانی لایەنگیری کافرەکان :

١-ڕازی بوون بەبێ باوەڕی کافرەکان وەیا بەکافر دادەنرێت یان دوو دڵی تێدابێت لەکافرییەکەیاندا یان بەڕاست دانانی هەر ڕێگایەك و یاسایەك کەئەوان لەسەری بڕۆن . وە ئەوان ئەگەر لایەنگیریان بکرێت زۆریان پێ خۆشە.

خوا گەورە دەفـەرموێ : ﴿ ودوا لو تكفرون كمـــا كفروا فتكونون سواء ﴾ (النساء : ٨٩) وە هـەروەك لـەوە پێش باسمان کرد کە دەبێ خۆشەویستی ورقی دڵ تەواو بێت وەدوو دڵی تێدا نەبێ چونکە ئەوەی کە کافری خـۆش بوێ لەبەر کوفرەکەی ئەوا ئەویش کافرە بەڕای هەموو زانایان بەبێ گومان لەوەدا. **(إبن تيمية)** ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی : (خۆشەویستی و دڵ ڕەقی و پێ ناخۆش بوون پێویستە هەموو دڵ بگرێتەوە نابێ کەم بکات تەنها بەکەمبوونی (ئیمان) بڕوا نەبێت ، بەڵام ئەو کردەوانەی کە مرۆڤ خۆی دەیکات ئەوا بە پێی توانایەتی ، وە هەرکاتێ پێ خۆش بوون و پێ ناخۆش بوونی دڵ تەواو بوو وەکردەوە کانیشی بەپێی توانای خۆی بوو ئەوا ئەگەر کردەوە کە نەشکات پاداشتی تەواو وەردەگرێ لەسەری چونکە هەندێك هەن کە بروباوەڕی دڵیان تەواو نییە لەبەر خۆشەویستی نەفس و ئارەزووی خۆیان نەوەك خۆشەویستی خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) خوایگەورە لەقورئاندا دەفەرموێ : ﴿ ومن أضل ممن اتبع هواه بغير هـــدى مـــن الله ﴾ (القصص: ٥٠) واتە: خۆشەویستی و ڕەزامەندی دوو شتن پەیوەستن بەیەکەوە ئەگەر بۆ

کافرەکان بێ ئەوا کوفرە و ئەگەر بۆ باوەڕداران بێـت ئـەوا باوەڕێکی راستە.

٢- لایەنگیری گشتی کافرەکان و پشت بەستن پێیان و کردنیان بەسەر خەرو یاوەرو هـاورێ وەیـان چـوونە نـاو دینەکەیانەوە وەبێ گومان پەروەردگار نەهی لەمەدەکات و دەفـەرموێ: ﴿ لایتخذ المؤمنون الكافرين أولياء من دون المؤمنين ومن يفعل ذلك فليس من الله فى شـــىء إلا أن تتقوا منهم تقاة ويحذركم الله نفسه وإلىالله المـــصير ﴾ (آل عمران:٢٨) وەبۆ شی کردنەوەی ئەم ئایەتە (إبـن جريـر) ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت لەتەفـسیرەکەیدا دەفـەرموێ : (ئەو کەسەی کە کافرەکان بکات بەپشت و پـەنای خـۆی و یارمەتی یان بدات دژی مسوڵمانان ولایەنگیریان بکات ئـەوا بێ بەشە لای خوا واتە بەریە لەخواو خواش بەریە لە و بە هەڵگەرانەوەی لەدینی ئیسلام و چوونە ناو کوفرەوە خوای گەورە دەفـەرموێ : ﴿ ياأيها الذين آمنوا لاتتخذو اليهود والنصارى أولياء بعضهم أولياء بعض ومن يتولهم منكم فإنه منهم إن الله لا يهدى القوم الـــضالمين ﴾(المائـدة: ٥١) واتــە ئــەی ئەوانــەی کــە بــاوەڕدارن لایــەنگیری جولەکــەو گاورەکان مەکەن چونکە ئەوان یەك لایەنگیری ئەوی ترە ،

وە ئەو کەسەی لایەنگیری یان بکات ئەوا هەر لەوانەو وەك ئەوان وایە وپەروەردگار هیدایەتی کۆمەڵی ستەمکاران نادات بۆ سەر ڕێگای ڕاست.

(ابن تيمية) زیاتر ئەمە ڕوون دەکاتەوە و دەڵێ :
(ئەوەی لایەنگیری جولەکەو گاورەکان بکات ئەوا لەوان دەبێت ئەگەر بێت و باوەڕی بەخوا بەپێغەمبەریش هەبێ (ﷺ) بەڵام بێ گومان باوەڕەکەیان کەمی هەیەو تەواو نییە چونکە ئەگەر تەواو بوایە ئەوا نەهی لە لایەنگیری کافرەکان دەکرد.

٣- باوەڕهێنان بەهەندێ لەو بیرو باوەڕانەی کە کافرەکان لەسەری دەڕۆن یان لەجیاتی پەنابردنەبەر قورئانەکەی خوا پەنا بەرێتە بەر بیروباوەری کافرەکان.
خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿ ألم تر إلى الذين أوتوا نصيبا من الكتاب يؤمنون بالجبت والطاغوت ويقولون للذين كفروا هؤلاء أهدى من الذين آمنوا سبيلا﴾ (النساء:٥١)
وەهەندێ لەو شتانەی کە بڕوا بوونە بەهەندێ لەکوفرو بیرو باوەڕیان بریتییە لە جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت وەهەندێك دەڵێن ئیسلام هیچ پەیوەندییەکی نییە

بەرامیاری (سیاسة)ەوە کە ئەمە مەسەلەیەکە لەئەوروپاوە بۆیان ئاو دیو کردووین و بۆیان هێناوین ئەمیش لەکاتی ڕیسوابوونی پیاوانی کەنیسەکانی ئەوروپا ڕووی داو دین و ڕامیاری یان لەیەکتری دابڕی . وەهەندێك لەوانەی کە لەباتی ئەوەی شتێکی باشمان لە ئەوروپا وە بۆ بێنن کەچی هاتوونەتەوە بەو ژەرەی کەپێیانەو دەڵێن دین هیچ پەیوەندی یەکی بەڕامیاری یەوە نی‌یە کە ئیسلامیشیان خستە ریزی کلێسەی ئەوروپی و دەڵێن گوایە کە ئیسلام پەیوەندی‌یەکە لەنێوان مرۆڤ لەگەڵ خوای خۆی دا وەرامیاریش پیاوی خۆی هەیە.

وە( سید قطب) ڕەحمەتی خوای لێ بێت زۆر لەسەر ئەم بوارە دەڕوات و ڕوونی دەکاتەوە.

٤- خۆشەویستی و لایەنگیری یان بەگشتی کە ئەمەش خوا فەرمانی نەکردنی پێ داوین، وەك دەفەرموێ: ﴿ لاتجد قوما يؤمنون بالله واليوم الآخر يوادون من حاد الله ورسوله ولوكانوا آباءهم أو أبناءهم أوإخـوانهم أو عشيرتهم ﴾ (المجادلة: ٢٢) واتای ئەم ئایەتە زۆر ئاشکرایە بەڵام بەشێوەیەکی کورت هەرباسی دەکەین کە دەفەرموێ

: باوەڕداری ڕاستەقینە بەخواو بەڕۆژی دوایی بەهیچ شێوەیەك دوژمنانی خواو پێغەمبەریان (ﷺ) خۆش ناوێت بەڵكو دژیان دەوەستن ئەگەر بێتو باوكیان یان كوڕیان یان برایان یان عەشیرەتەكانیشیان بێت. وە(شیخ الإسلام) ابن تیمیه ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرموێ : (هەركەسێ لایەنگیری دوژمنانی خوابكات بەدڵی بێت یان بەكردەوەی بێت ئەوا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە دڵی باوەڕی تەواوی نییە وەخوا لەئایەتێكی تردا دەفەرموێ : ﴿ ياأيها الذين آمنوا لاتتخذوا عدوی وعدوكم أولياء تلقون إليهم بالمودة وقد كفروا بما جاءكم من الحق ﴾ (الممتحنة:١).

٥- (الركون اليهم) واتە ڕاز بوون بەهەموو شتێكیان ، وەك خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿ ولاتركنوا إلى الذين ظلموا فتمسكم النار ومالكم من دون الله من أولياء ثم لاتنصرون ﴾ (هود: ١١٣) ..( ئیمامیقرطبی ) دەفەرموێ : (ركون) واتای پشت بەستن وڕازی بوون بەهەموو شتێكیان . وە (قتادە) دەفەرموێ واتای ئایەتەكە : خۆشتان نەوێن و بەقسەیان مەكەن . وە( ابن جریج) دەفەرموێ لایەنگیری

یان مەکەن . وەبەگشتی واتـای ئایەتەکـەو واتـای ووشـەی (رکـون) ئەمەیـە : واز لێهینـانی کافرکـان و ئەوانـەی کـە خراپــەکارن و خــەریکی دروســت کردنــی شــتی تــازەن لەدینەکـەدا واتــە: داهێنــراو (بدعــة) لەدینــدا . هــەرکاتێ هاورێیەتی ئەمانە بکەین ئەوا کوفرە و سەرپێچی کردنە لە فرمانـــەکانی خـــوا چـــونکە هـــاورێ یـــەتی مانـــای خۆشەویـستییانە ، وەك ووتـراوە ئەگـەر وویـستت یـەکێك بناسـیت ئـەوا پرسـیار لـەخۆی مەکـە بـەڵکو پرسـیار لـە خورەوشتی هاورێکەی بکە.

٦- زۆر بەلادا چـوونیان و قـسەی خـۆش و سـوعبەت لەگـەڵ کردنیـان لەسـەر حیـسابی دینەکـەدا خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿ ودوا لو تـــدهن فیـــدهنون ﴾ (القلم: ٩) وەبـەلادا چـوونیان و قـسەی لـوس و هـیچ و پـوچ لەسـەر حیسابی دینەکە لەژیان ئەمرۆی مسوڵمانان زۆر دەیبینین ، کە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ بەزینی دەروونـی مـسوڵمانان و ڕەش بینینیان چونکە دەبینین کافرەکان و دوژمنانی خـوا زاڵ بون لەلایـەنی هێـزو توانـای مـاددی دا ئـەوانیش پـێی هــەڵ خەڵــەتان و ترسـان لێیـان . ئـەم ترسـە چەسـپی

لەمێشکی ئەوانەدا کەباوەڕیان کزە .وە وا دەزانن کە ئەوان نیشانەی هێزو توانان . لەبە رئەوە ووردە ووردە لەفرمانەکانی دینەکەیان دەتەکنەوە بۆ نزیك بوونەوە لەکافرەکان و رێ وشوێن گرتنیان.

وەك پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) دەفەرموێ: ((لتتبعن سنن من كان قبلكم شبرا شبرا وذراعا ذراعا حتى لو دخلوا جحر ضب تبعتموهم)) قلنا : يارسول الله : اليهود والنصارى ؟ قال : ((فمن)) ؟ [صحيح البخارى/ كتاب الأعتصام/ (٣/٣٠٠) حديث (٧٣٢٠) و رواه مسلم فىكتابالعلم/٢٠٥٤(٢٦٦٩)].

واتە : دوای رێ و شوێنی ئەوانەی پێش خۆتان دەکەون بست بست وەباڵ بەباڵ هەتاوەکو ئەگەر بچنە ناو کونی بزن مژەوە دوایان ئەکەون ئێمەش ووتمان : ئەی پێغەمبەری خوا جولەکەو گاورەکان ؟ ئەویش فەرموی : هەیە لەوان زیاتر . قسەی خۆش و سوعبەت و مجادلە کردن بەشێکی بچووك دەست پێ دەکات دوایی ووردە ووردە زیاد دەکات تاوەکو(پەنا بەخوا) لەدین دەردەچێ وەلەوشتانەی کە زۆر ئاشکرایە لەمێژووی مسوڵمانانداکە

گەورەترین یاریدەدەری سەرکەوتنە دوای باوەڕبەخواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) شانازی کردنە بەئیسلامەتی خۆیانەوە . بەڕاستی ئەمەش قسەکەی (عمری کوڕی خەتاب)ە ڕەزای خوای لێ بێت دەری دەخات کە دەفەرموێ : (إنا كنا أذل قوم فأعزنا الله بالاسلام فمهما نطلب العزة بغير ما أنزل الله به أذلنا الله) [الحاكم في مستدركه (١/ ٦٢) كتاب الأيمان . ووافقه الذهبی]..واتە : ئێمە قەومێکی زۆر زەلیل بووین خوا سەربەرزی کردین بەئیسلام وە هەرکاتێك داوای سەربەرزی بکەین بەبێ ئەوەی کە خوا پێی داوین زەلیمان دەکات .

٧- کردنیان بە(بطانة) واتە هەموو قسەو نهێنیيەکیان لابدرکێنرێت .

خوا دەفەرموێت : ﴿ يا أيها الذين آمنوا لاتتخذوا بطانة من دونكم لا يألونكم خبالا ودوا ما عنتم قد بدت البغضاء من أفواههم وماتخفى صدورهم أكبر قد بينا لكم الآيات إن كنتم تعقلون ﴾(آل عمران : ١١٨).

ئەم ئایەتەلەسەرچەند مسوڵمانێك هاتە خوارەوە کە زۆر دڵ ساف بوون لەگەڵ دوو ڕوەکاندا (المنافقون)

وەهامو شۆی یەکیك لەجولەکەکانیان دەکرد لەبەر ئەوە ناسیاوی و لەیەك نزیکی و دراوسێیەتی یەی کە هەبوو لە نیوانیاندا ، لەبەر ئەوە خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە فرمانی نەکردنی پێ دان بۆ ئەوەی فیتنە دروست نەبێ.

وە(بطانة الرجل) واتە تایبەتیەکانی چونکە کە دەڵێن (بطانة) وەك جلێك وایە کەلەش دادەپۆشێ وەهەر کەسێ نهێنی یەکێکی تری لابێت دەبێت بیارێزێت چۆن وەك جل لەش دادەپۆشێت و دەیپارێزێت.

وە پەروەردگار بۆیە دەڵێت مەیانکەن بە داپۆشەری نهینیەکانی خۆتان چونکە هۆیەکەی بۆ دیاری کردووین کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ لايألونكم خبالا ﴾ واتە: کەمتەر خەمی ناکەن لەهێزو توانایاندا بۆ ئازاردان و حەیابردن و شەڕ فرۆشتن پێیان ئەوەش بزانەکەدەیانەوێ هەر چۆنیك بێت لە ناوتان بەرن.

پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) دەفەرموێ: ((الرجل على دين خليله فلينظر أحدكم من يخالل)) [سنن أبي داود كتاب الادب (٥٠/ ١٦٨)و الترمذي في الزهد (٧/ ١١١)]..واتە : هەموو کەس لەسەر دینی هاوڕێکەیەتی دەبا بزانن هاوڕێتان کێیە؟.

٨- بەقسەکردنیان لەوەی کەفەرمانی پێ دەدەن ودەست نیشانی دەکەن: پەروەردگار بۆ ئەوەی کەئەمە نەکەین فرمانمان پی دەداو دەفەرموێ: ﴿ ولا تطع من اغفنا قلبه عن ذكرنا واتبع هواه وكان أمره فرطا ﴾ (الكهف: ٢٨)..وەهەروەها دەفەرموێ: ﴿ يأأيها الذين ءامنوا إن تطعوا الذين كفروا يردوكم على اعقابكم فتقلبوا خسرين ﴾ (آل عمران: ١٤٩).کەواتە واتای گشتی ئەم ئایەتەو زۆری تریش لەوبابەتە هەیە کە دەفەرمووێ: بەقسەی ئەوانە مەکەن کەدڵیان بی ئاگایە لەپەروەردگار شوێن هەواو ئارەزووو کەوتوون وەئەگەر شوێنیان بکەون لەدینەکەی خۆتان کەئیسلامی هەڵتان دەگێڕنەوە وخەسارەت مەن دەبن، وەلە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿ وإن الشيطين ليوحون إلى أوليائهم ليجادلوكم وإن أطعتموهم إنكم لمشركون ﴾ (الأنعام: ١٢١)..واتەك نەفرەت لێ کراوەکان کەطاغوتن بەلایەنگرانی خۆیان دەڵێن کەبکەونە قسە لەگەڵتان وموجادەلەتان بکەن وەئەگەر ئێوەش بەقسەیان بکەن ئەوابێ باوەڕن و شەریکتان بۆ خوا قەرارداوە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ اتخذوا

**احبارهم ورهبانهم اربابا من دون الله** ﴾ (التوبة: ٣١) واتـه: مالومو قەشەکانیان کردووە بەخوای خۆیان جگـە لـە (الله) چونکە حەڵاڵیان بۆ حەرام دەکردن وە حەرامیان بۆ حەڵاڵ دەکردن.

**٩- دانیــشتن لەگەڵیانــداو ئایــەت هێنانــەوە بۆیــان** لەگاڵتەکەدا چونکە گاڵتەبەو ئایەتانە دەکەن لەبەر ئـەوەی باوەڕیان پێ‌نی‌یەن لەبەر ئەوە خوای گەورە دەفەرموێ کە ئەمەنەکەبن: ﴿ **وقد نزل عليكم في الكتاب أن إذا سمعتم ءايات الله يكفربهاو يستهزأ بها فلا تقعدوا معهم حـــتى يخوضوا في حديث غيره إنكم إذا مثلهم** ﴾ (النساء: ١٤٠) دەفەرمووێ: (لەقورئانەکـەی خـوادا بۆتـان هـاتووە ئەگـەر گوێتان لێ بوو ئایەتـەکانی خـوا ڕەت دەکرێتـەوەو کـوفری پێ دەکری‌و گاڵتەی پی دەکرێ ئـەوا لەگـەڵیان دامەنیـشن تاوەکو باسی شتێکی تر دەکەن ئەگینا ئێوەش وەك ئەوان دەبن (تفسير الطبری ٥/٢٣٠) وە ئەمـە ئەوانـەش دەگرێتـەوە وەك چۆن (تفسير الطبری) باسی دەکات وە دەڵی ئەوانەی کە داهێنـەری شتی تازەن لەدینداوە خـەریکی قـسەی هـیچ وپوچ و دووڕیی‌ی وتێکدانی نێوان موسڵمانانن.

١٠- یەكێك یان زیاتر لەئیشی موسڵمانانی پێ بسپێردرێت وەك سەركردەیی ونووسەری بەڕێوەبەریو.. وەلایەنگیری وبێ بەری بوون دژی یەكن وەبە هیچ شێوەیەك پێكەوە ناگونجێن، وەباوەڕداری بەبی بەری بوون لەكافرەكان تەواو نابێتو كەم دەهێنێ وهەركەس لایەنگیری یان بكات ئەواوەك ئەوان وایە چونكە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿..ومن يتولهم منكم فإنه منهم..﴾ (المائدة: ٥١).

گاوەركان یەكەم ئەمانەت وشەهادەتیان بریتی یەلە (بسم الله الاب والأبن والروح القدس إله واحد) بەم شێوەیە یەك دەكەن بەسیانو سیانیش دەكەن بەیەك، وە هەروەها خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿لقد كفر الذين قالوا إن الله ثالث ثلثة..﴾ (المائدة: ٧٣).

١١- ئەمانەتیان پێ بسپێردرێت لەگەڵ ئەوەی كە خوای گەورە بەخیانەتكاری داناون، خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ومن أهل الكتاب من إن تأمنه بقنطار يؤده إليك ومنهم من إن تأمنه بدينار لايؤده إليك إلا مادمت عليه قائما ذلك بأنهم قالوا ليس علينا في الأمين

سبيل ويقولون على الله الكـــذب وهـــم يعلمـــون ﴾ (آل عمــران: ٧٥).. واتـــه: نابيّـــت ئەمانـــەت بـــەكافرەكان بسپێردرێت لەگەڵ ئەوەی کەخیانەت کارن و بیٚ باوەڕن بە ئیسلام.

١٢- ڕزای بوون بەکردەوەکانیان ولێك چونیان ولەبـەر کردنی جلو بەرگی وەك ئەوان (كتاب التوحيد/١١٧).

١٣- ڕووخۆشی وسـنگ فراوانیوبەخـشندەییو هـەوڵ دانی نزیك بونەوە لیٚیان (كتاب التوحيد/ ).

١٤- یارمــــەتی دانیـــان لەســــەر ســـتەمو زۆریـــان وسەرخـــستنیان، وەقورئـــان دوونمونـــەمان بـــۆ دێنێتـــەوە لەسەر ئەم باسە:

(أ) ژنـی پێغەمبـەری خـوا (لـوط) (عليـه الـسلام)کـەڕێگا پیـشاندەری قەومەکـەی بـوو بـۆ ئیـشە خراپـەکانیان وڕیی پیشان دەدان بۆ میوانەکانی (لوط) (عليه السلام).

(**ب**) وە هـەروەها بەهـەمان شـێوە ژنەکـەی (نـوح) (عليـه السلام).

١٥- وەرنـــەگرتنی ئامۆژگـــاری یـــانو بەباشـــە بـــاس نـــەکردنیان وەئێـــشەباشەکانیان نەخرێتـــە پـــێش چـــاوی

خــەڵکی وەبــەم جــۆرە لــەم ســەردەمەی دوایی‌دا ئــەم شـێوانەمان هـەموو بینیـوە بەتایبـەتی کۆمـەڵی ڕۆژهـەڵات ناسەکان وکۆمەڵی گاوران وڕێخستنەکانیان‌و کلێـسەکانیان کە بەرنامە زانستی‌یەکان دێننە پێش چاو وبەپێش کەوتن‌و وشارسـتانیەتی‌دا دەنـێن وەگـەلێك نـاوی تـریش لێ دەنـێن وەنـــاوی کۆنەپەرستی‌وســـستی‌و دواکـــەوتوویی دەنـــێن بەئیـسلامەوە دەڵـێن ناتوانــێ لەگـەڵ شارسـتانی تـازەدا بگونجێ وهاوشانی وولاتە پێش کەتووەکات بێت.

١٦- بە گەورە دانانیان وەناوی گەورە لێ نانیـان وەك (گەورەم، بەگم، ئاغام) وە هەروەها یەکـەم جـار سـەلام لێ کردنیان، کەئەمانە هەموو خوا گەورە فرمانی نەکردنی پــێ داویـــن، وە لـــەم ســـەردەمەدا زۆر لەنەزانـــەکان ئەگـــەر دوژمنێکـی خوایـان بینـی یەکـەم جـار ئـەمان سـڵاویان لێ دەکەن وەدەست بەسنگیانەوە دەگرن بۆیـان کـە بەڵگـەی خۆشەویـستی یـە بۆیـان وەیـان دەسـت لەسـەر سـەریان دادەنێن وەك بڵێن ڕیزتان لەسەر سەرمان وەئەم کردەوانـە مەترســـی ئـــەوەی هەیـــە ســـەرەڕای حـــەرامی یەکـــەی کەموسڵمان لەدین دەربچێ پــێ‌ی، چـونکە ئەمـە ئەوپـەڕی

لایەنگیری خۆشەویستیەیە بۆ دوژمنانی خوا. (تحفة الإخوان ، حمود التويجري، ص: ١٩).

وەهــەروەها بەگــەورەدانانو ناونــانی نــاوی گــەورە پیاوان نیشانەی بەرزی وڕێزە وەهەردوكیان بـۆ موسـڵمانن نەك بۆ كافر چونكە ئـەوان لای خـوای گـەورە هـیچ وپـووچ وگومڕاو بێ ڕێزن.

١٧- نیــشتە جــێ بــوون لەگەڵیانــدا لــەماڵیانو زۆر كردنو گەرم كردنی مەجلیسیان. پێغەمبەری خۆشەویـست (ﷺ) دەفــەرمووێ: ((مــن جــامع المــشرك وســكن معــە فإنە مثلــە)) [رواه ابـوداود كتـاب الجهـاد (٣/٢٢٤) وقـال الألبـاني حديث حـسن]..واتــە: ئــەوەی لەگــەڵ بــێ بڕوایانـدا دابنیـشێ وەنیشتەجێ بێ لەگەڵیاندا ئەوا ئەویش وەك ئەوانە.

١٨- یارمەتی دانیان بۆ چاڵ هەڵكەندن بۆ موسڵمانان وەبــــــەجێ هێنـــــــانی نەخـــــــشەكانیان وەچـــــــوونە ناوپەیمانەكانیانەوە جاسوسی گردن لەپێناوی ئەوانـدا، وە دەرخــستنی نهێنــی موســڵمانانو شــەڕ كــردن لــەڕێزی كافرەكانـدا وەئـەم وێنەیـە ترسـناكترین شـتە كەنەتـەوەی موسڵمان پێوەی دەناڵێنێت چونكە ئەم زاراوەتازەیەی كـە

ناویان لێ ناوە (الطابور الخامس) کە بەتەواوی پەروەردەو فێربوونی ڕۆڵەکانی نەتەوە کەمانیانی خراپ کردووە، وەهەروەها لە بواری ڕامیاریو حوکمو ئەدەبو خوڕەوشتو دینو دنیا.

١٩- ئەوانەی لەئیسلام هەڵ دەگەڕێنەوە بۆ شەڕفرۆشتن لەڕقی چەند موسوڵمانێك ولەبەر خۆشەویستی کافرەکان.

٢٠- ئەوانەی کە چونەتە ناو حیزبە عەلمانیەکانەوەو حیزبە بێ باوەڕو شیوعیو ئیشتراکیو نەتەوایەتیو ماسۆنیو هەوڵدان لەپێناویانداو لایەنگیرانو خۆشەویستی وسەرخستنیان. (الردة بين الأمس واليوم، ص: ٤٠)

هەندی جار چەند لایەنگیرێکی کافرەکان بەهانە دەگرن بەوەی ئەترسن کە دەسەلاتیان ومالْ وسامانیان ویلەوپایە یان لەدەست چێ وەزۆر ترسی تریش کەڕاست نین وەبەهیچ شێوەیەك خوای گەورە وەری ناگرێو ڕازی نابێ پێی بۆئەوەی لێ یان ببورێ چونکە هەموویان لەڕازاندنەوەی شەیتانەوە خۆشەویستی دیناو هەواو ئارەزووە.

وه پـــــهروهردگار هـــــيچ بههانهيــــهكی لهكــــهس وهرنهگرتووه ولێيان قبولْ ناكات بۆ لايهنگيری كافرهكانو بهقسهكردينان لهدينو دنيادا تهنها يهك دانهيه نـهبێت لـهو بههانانه ئهويش ئهوهيه كه بهزۆر پێت بكهن، خوای گهوره دهفهرمووێ: ﴿ من كفر بالله من بعد أيمانه إلا من أكـــره وقلبه مطمئن بالإيمان ولكن من شرح بـــالكفر صـــدرا فعليهم غضب من الله ولهم عذاب عظيم، ذلك بـــأنهم استحبوا الحيوة الدنيا على الآخرة وأن الله لايهدي القوم الكافرين ﴾ (النحل: ١٠٦-١٠٧).

بهلاَم جاری واههيه كهموسولْمان زۆری لێ دهكرێت بـۆ لايهنگيری كافرهكان بهلاَم ئهم زۆرداریيه هيچ دهسـهتێكی نیيه بهسـهر دلاَنـدا چـونكه كـهس نـازانی دلْ چـی تێدايـه خوانهبێ، ههرچۆنێك بێت ههر كهسێك لايهنگيری كافرهكان بكات بـهدلْ نـهك بـهزۆر ئـهوابێ گومـان كـافره، وهئـهوهی بـهزاتو بـهكردهوه لايـهنگيری يـان بكـات ئـهوا هـهركافره بـهلاَم ئهگـهر بهقـسهو كـردهوه ئاشـكرای نـهكات وهبـهدلْ لايـهنگيری يـان بكـات خـۆی بهموسـلْمان دابنـێ ئـهوا ئـهو كهسه دووڕووه (منافق) وه لهخوارووی دۆزهخهوهيه.

## وەستانی موسڵمان بەرامبەر ئەم حاڵەتانە

لایەنگیری و بەری بوون وێنەیەکی کردەوەی ڕۆژانەیە کەهەمووما‌ن دەزانین ئەمیانە یان ئەویان کەتێگەیشتنێکی گەورەیە بۆ موسوڵمان بەقەدەر گەورەیی بیروباوەڕ لەدڵی مرۆڤدا کە پەروەردەگار لەم ئایەتەدا باسی دەکاو دەفەرمووێ: ﴿ لا إكراه في الدين قد تبين الرشد من الغي فمن يكفر بالطاغوت ويؤمن بالله فقد آستمسك بالعروة الوثقى لا آنفصام لها والله سميع عليم ﴾ (البقرة: ٢٥٦).

وەپەروەردگار ڕێزی لەموسوڵمان گرتووە وەتایبەتی ومرۆڤ بەگشتی، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ ولقد كرمنا بني آدم.. ﴾ (الأسراء: ٧٠) وە هەرکاتێ لایەنگیری موسوڵمان بۆ پەروەردگارو حیزبەکەی باوەڕداران بەگشتی بوو ئەوا ئەم ڕێزلێ گرتنە پەروەردگار بۆ موسڵمان حەقی خۆی دەردێتی وەبگرە زیادیش دەکات بەڵام ئەگەر پشت هەڵکات جگە لەخوا یەکێکی تر بپەرستێ ئینجا بەشەریعەت بێ یان بەیاسایەکی داڕێژراوی مرۆڤ خۆی بێ بەم شێوەیە لەوپلەو پایەو ڕێز دێتە خوارەوەو هەواو

ئارەزوو ژیانی پارچە پارچە دەكات وئەودنیای لەدەست دەچێ، وەبە دڵ ناخۆشی دەژی ئەگەر بەدەم بشڵێت كە دڵی خۆشە، چونكە، پلەی دڵخۆشی لەبەندایەتی خواوە هەڵدەقوڵێ وە دڵناخۆشی لەدوژمنایەتی خواوە پاشان دوا كەوتنی هەواو ئارەزوو هەڵدەقوڵێ (خوا پەنامان بدات).

وە لایەنگیری بێ بڕوایان سەرەڕای ئەوەی كەبێ ئەمری فرمانی خوایە سەرچاوەی دڵە ڕاوكێیە (قلق) ولێك جیابوونەوەی ئەو كەسەیە لەكەسایەتی (شخصیة) خۆی، بەتایبەتی لەم سەردەمەدا كەبیروباوەڕو ڕەئیەكان تێكەڵابوون ڕاستو هەڵەجیاناكرێتەوە لەیەكتری پێویستە لەم كاتەدا موسوڵمان لای كێ بگرێ ولە كوێ بوەستێ؟ وەلایەنگیری یەكەی بۆ كێ بێت ، كە دەبینی بە ئاشكرا كوفر دیارەو ئاڵای بەرزكدۆتەوەو ودەڵێ ئەمە لەگەڵ ئیسلامدایەو دژی ناوەستێ وەك دەڵێن ئەمە سوشیالیستیە یان دیمكراتیە یان علمانیە یان نەتەوایەتیە یان شیوعیە لەبەرچی دەڵێن كەدژی ئیسلام نیە؟ چونكە دەڵێن ئیسلام پەیوەندیەكە لەنێوان مرۆڤ لەگەڵ خوا خۆیدا؟! لەم كاتەدا كە موسوڵمان

دەبینیٚ یاسای پـەروەردگارو بەرنامەکـەی لەسـەر زەویـدا ئیـشی پـیٚ نـاکریٚ وبگـرە شەڕیـشی لەگـەڵ دەکـریٚ لایەنگیری کیٚ بکا؟ وەلەجیاتی بەرنامەکەی خـوای گـەورە یاسـایەکی داڕیٚـژراوی مـرۆڤ دێننـە پیٚـشەوەو دەیکـەن بـە بەرنامەی ژیان بـەناوی ئـەوەی کـە گوایـە یاسـای ئیـسلام لەگەڵ شارستانیٚتی وپیٚشکەوتندا ناڕوات.

بەلاّم کە ئەمە بینراو دوو ڕووەکان کەڕیٚگە خۆشکەرن بۆئەو جۆرە کەسانە کەزۆر ترستاکترن لەوانـە کەبەئاشـکرا دژی ئیسلام دەوەسـتن لـەم کاتـەدا موسـولّمان لایـەنگیری کیٚ بیٚت؟ ئەم پرسیارانەو زۆری تریش دیٚتە پیٚشەوە بـەلاّم وەلاّمەکەی لەم ڕاستییەدا کۆدەبیٚتەوە (هیچ موسـولّمانیٚك لایەنگیری بۆ خواو دینەکەی و بڕوادارن بەدلـسۆزانە نابیٚـت ئەگـەر دلّنیانـەبیٚ لەڕاستییەکتاپەرسـتییەکەی (توحیـد) پــەروەردگار (لاإلـــه إلا الله محمــد رســول الله) بەتــەواوی لەسەری بڕواتو واتای ئەم پارچە ووشەیە بزانیٚ بە هـەموو پیٚویستییەکانیەوە دوای ئـەوە دەبـی بزانیٚـت کەنـەزانیو شەریك پەیدا کـردن بـۆ پـەروەردگار کـوفرو هەلّگەڕانـەوەو

دووروویی چین بۆئەوەی نەکەوێتە تـۆڕی ڕاوی ئـەم جـۆرە شــەڕانەوە. وەلەبــەر ئــەوەی کــە بزانێــت ئیــسلام واتــای چـیـیە؟ پێویـستە کـە دژەکـەی بزانێـت واتـای چـیـیە؟ وەدەبێ زانیاری تەواوی هەبێ دەربارەی لایـەنگیرو بـەری بوون واتای چیـیە لە ئیسلامدا؟ وەلایەنگیری لەتێگەشتنی تەواوی ئیـسلامدا واتـای خۆشەویـستیو سەرخـستنی هـەر بڕوادارێـك بێـت کەهــەر نـەژادێك بێـت لەهــەرووڵاتێك بێـت بەهەر زمانێك قسە بکـات، چـونکە ئـەویش بـڕوای تـەواوی هەیە بەبیروباوەڕی ئیسلام ودوورە لەنەزانیـیـەوە، وە ئـەو پەیوەندیـیــە کــە دەیانبەســتی بەیەکــەوە بریتــی نیـیــە لەپەیوەنـدی خـوێنو وخزمایـەتیو عـادەتو نەتەوایـەتی وخاك. ئەویش لەگەڵ برا موسوڵمانەکانیدا بەدڵ وبەزوبانو بەماڵ وخوێنی دلگران دەبێ بـەئازاریان وە دڵخۆش دەبـێ بەخۆشــیـیان، وەڕق وکینــەی هەیــە بەرامبــەر هــەموو دوژمنانی خـوا ئینجـا ئەگـەر هـەر لەبنەچـەدا کـافربن یـان هەڵگەڕاوەبن یان دووڕووبن.

وه وەستانی بەرامبەریان جیهادکردن و بەگیانو ماڵ وپێنوس وزوبان وهەرچۆیەکی پێ درابێ لەهێزوتوانای خۆی ئەمە ئەوڕاستی یە یەکەئەگەر موسوڵمان هەستی پێ بکات وئیشی پێ بکات ئەوا بەئاسانی دەتوانێت شوێنی خۆی و ڕەئی خۆی دیاری بکات بەرانبەر بەو شوێنانەی کەباسمان کرد ئەو کاتە دەزانێ لایەنگیری بکات و دوژمنایەتی کێبکات وە ئیسلام چی لەو دەوێ وەچی لەدوژمنەکانی دەوێ، بەوشێوەیە ئەو موسوڵمانە ئاگاردارو سەربەرز دەبێ بەوەی کەخوای گەورە پێی بەخشیوە ودڵگران نابێ، وەك چۆن خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ ولا تهنوا ولاتحزنوا وأنتم الأعلون إن كنتم مؤمنين ﴾ (آل عمران: ١٣٩).

وەهەرکەسێك خوای لەگەڵدا بێت هیچ کەسێك ناتوانێ زیانێکی کەمیشی پێ بگەیەنێ ئەگەر هەموو دنیاش کۆبێتەوە لەسەری مەگەر ڕەزامەندی خوای گەورەی لەسەر بێت.

# هەڵس و کەوتی موسڵمانان لەگەڵ بێ بڕوایاندا

*وەئەمەش سی لێ کۆڵینەوەی لەسەرە:*

جیاوازی نێوان لایەنگیریو پاشی هـەڵسو کـەوت، نـا چاربووم کەباسی ئەم مەسەلەیە بکەم بۆ ڕوون کردنـەوەی لایەنی ڕاستی وهەڵە دەربارەی ئـەم تێگەیشتنە هەڵەیـەی کـە خـەڵکی تـێی گەیـشتوون ئـەوەی کەڕاسـتو ناڕاسـت تێیدا تێکەڵاوبووە وەك چۆن قوتابیـانی عـیلم کـە جـارێ سـەرەتایین سـەریان دەسـوڕمێ لـەڕەئی گـەورە مامۆسـتایانیان کـە دەڵـێن: ( برامەسـیحیەکانمان یـان برائاشوریەکانمان یان جولەکەکانمان ) کە دەیانەوێ بەم وەستانەیان بەرامبەر بە خاچ پەرستەکان و غـەیری ئـەوان موسوڵمانان بتوێنەوە لەناو ئەواندا و بونیـان کـەم بێتـەوە وە حەزدەکەم لەسەرەتاوە دەیڵێم کە هەموو ئـەو بەرنامـە ئاسمانیانەی کە خوای گەورە ناردوویەتی بۆسەر پێغەمبەر ($\rho$) هەموویان مەبەستیان پەرستنی تەنها یەك خوایـە کـە (اللە)یە، پەروەردگار دەفـەرمووێ: ﴿ ولقد بعثنا في كـــل

أمة رسولا أن اعبدوا الله واجتنبوا الطاغوت..﴾ (النحل: ٣٦)..سەرە ڕای ئەوەی کە شەریعەتەکانیان جیاوازە لەبەر حیکمەتێکی خوایی کە ئێمە هیچی لە بارەوە نازانین بەڵام ئەو بەرنامانەی کەپێش ئیسلام هاتوون هەمووان تێك دراوەو گۆڕانی تێدایە لەلایەن مرۆڤەوە پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿ فويل للذين يكتبون الكتاب بايديهم ثم يقولون هذا من عندالله ليشتروا به ثمنا قليلا فويل لهم مما كتبت ايديهم وويل لهم مما يكسبون ﴾ (البقرة: ٧٩).

هەر لەبەر ئەوەش بوو کە پەروەردگار شەریعەتی بەرنامەی ئاسمانی یەکانی تری بە شەریعەتی ئیسلام سڕییەوەو کردی بەیاسای مرۆڤ لەسەر زەویدا.

وە ئێستاش پێویستە هەندێ لەووتەی ئەوانە بخەینە پێش چاوکە بانگی نزیك کردنەوەی دیانەتەکان دەکەن لەیەکتری وەناوی خۆیان نا بەوەی کەدەیانەوێ بەم کردەوەیەیان خزمەتی ئیسلام و مرۆڤایەتی بکەن بەگشتی:

١- (الشيخ مصطفى المراغي) لە یەکێ لەونامانەی کە ناردوویەتی بۆ کۆڕی دیانەتەکانی جیهان دەڵێ: (ئیسلام

لــــەڕەگو ڕیــشاڵەوە قینـــی دینـــی دەربـــارەی ئاینـــە ئاسمانیـیـەکانی تـر لـەدڵی موسـوڵمانانـدا دەرکێـشاوە وە دانی ناوە بە برادەرایـەتی جیهـانی لـەنێوان هـەموو جۆرە نـەژادێکی مـرۆڤ وەلاری لەوەنییـە کـە هـەموو ئاینـەکان لـەنزیکی یەکـەوە شـان بەشـان بـژین) [آثـار الحـرب في الفقـه الإسلام، د.وهبة الزحيلي (ص: ٦٣) الطبعة ١٣٨٠ هـ].

٢- (الشیخ محمد أبو زهـرة) دەڵـێ: ئەگـەر ئاینـەکان لەشـتێکدا ڕێـك نەکـەوتن ئـەوا هەرکەسـە بـۆی هەیـە کـە بانگەواز بۆ دینی خۆی بکات بەحیکمەتو ئامۆژگاریـیـەوە بـەبێ ئـەوەی خۆپـەرستی چـاوی کـوێر بکـات لەئاسـتی ڕاستییەکاندا وە زۆری هەڵخەڵەتاندنی ماڵو سامان نـەبێ بە بەڵگەی ڕوون وئاشـکرا) [العلاقـات الدوليـة في الإسـلام، (ص: ٤٣) الدار القومية للطباعة سنة ١٣٨٤ هـ].

٣- بـــەڵام (د. وهبـــة الزحيلـــي) دەڵێـــت : (لـــە ئامانجەکانی ئیسلام ئەوەنییە کە خۆی بسەپێنێ بەسـەر خەڵکیدا بۆ ئەوەی ببێتە تاکە ئاینی جیهانی چونکە ئەمانە هەوڵـدانێکی سـەرنەکەوتووە وە دژەوەسـتانێکە بەرامبـەر سـوننەتی بوونـەوەروژیان وەدژایـەتی یەکـە لەگـەڵ هێـزو

توانـای پــەروەردگاردا) [آثـار الحـرب في الفقـه الإسـلامي، (ص: ٦٥)].

وەزۆری تـریش هــەن جگــە لــەم سـیانە، وە ئــەوەی ئاشـکرایەو دیـارە کـە ئەمانـەو کەسـانی تـری وەك ئـەمان پێـشتیان بەسـتووە، بـەوەی کـە مامۆسـتای یەکـەمیان (جمال الديني الأفغاني) ووتووویەتی کـە زۆر لـەبیروباوەڕی ماسۆنی پـیس‌و هـیچ وپـوچ کـاری تـێ کـردووە، وەیەکـەم کەس بوو کە ئالای بانگەوازی برادەرایەتی نێوان ئاینەکانی هەڵگرت وەلەبیروباوەڕی خویدا ناونیـشانێکی هەڵبـژاردبوو (نظريـة الوحـدة) واتــە (بـیردۆزی یـەکێتی) کـە دەقەکـەی ئــەوەبوو ( دوای لێ کۆڵینــەوەو گــەڕان‌و دیقەتــدان بینــیم کەســێ ئــایینی یەکتاپەرسـتی یەکـە لەســەر بیروبــاوەڕو ئامانجیــان یــەك کــەوتوون ئەگــەر کــەم‌و کــوڕی یــەك لەیەکێکیاندا هەبوو لەوانـەی کـەخێرو خۆشـی تێدایـە ئـەوا ئــەوی تریــان تــەواوی دەکـات) وەلەســەر ئەمــە دەڵــێ: وەلەسەر پێـشنیاری ئەمـە وەبـۆم دەرکـەوت بەهەسـتێکی نەرمــەوە کــە ئامــانجێکی زۆر گــەورە دیــارە لــەدوورەوە کەئەویش یەك بوونی بـاوەڕدارانی ئـەم سـێ ئایینەیـە وەك

چۆن ئايينەكان يەكن لەناوەڕۆكو بنچينەو ئامانجدا وەبەم يەك بوونەش مرۆڤ هەنگاوێك دەنێ بۆ پێشەوە لەبواری ئاشتیدا كە هەنگاوێكی گەورەیە لەم ژیانە كورتەدا. وەنیازم وایە چەند ڕێو شوێنی دابنێم بۆئەم بیردۆزەو لەسەری بنووسم وەبانگەوازی بۆبكەم. لەسەر ئەمەشەوە من هیچ تێكەڵاوییەكم نییە لەگەڵ باوەڕدارانی ئاینەكانی تردا بەگشتی ولەنزیكەوە لێم نەكۆڵیونەتەوە وهۆی پارچە پارچەبوونی كەسانی یەك ئاین تا ئێستا نازانم. [خاطرات جمال الدين الأفغاني (ص: ١٤)، (ص: ١٥٨) حزاء بالقاهرة].

وە ئەم قسانەش كە (جمال الدينی الأفغاني) كردوویەتی هەڵەیەكی یەكجار زۆری تێدایە كە ئاشكرایە لای ئەوكەسەی هۆشی لای خۆی بێت پێم نالّی كی ووتوویەتیك كە دینی ئیسلام ڕێگەئەدا بەگاور كەبانگەواز بكا بۆ دینەكەی یان جولەكە یان هەردینێكی تر بێ كەبێ گومان یان لەدانانی مرۆڤ خۆیەتی یان گۆڕانی لەدینە ئاسمانییەكاندا كردووە؟

ئایائەوانەی كە بانگەوازی ئەمەدەكەن نازانن كە خوا لە قورئاندا باسی بەنی ئیسرائیل دەكا كە چۆن

پێغەمبەرانیان کوشتووە وتەورات وئینجلیان گۆریوە ئـەوە گاڵتەی پێ کردنەبە کتێبە ئاسمانیەکانی تر چـۆن هـەواو ئارەزووویان لیێ بوێن؟

ئایانازانن کەخوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿ لقد كفــر الذين قــالوا ان الله ثالــث ثلاثــة ﴾ (المائدة: ٧٣) وە دەفـەرموێ: ﴿ وقالت اليهود عزيــر ابــن الله وقالــت النصارى المسيح ابن الله ذلك قولهم بأفواههم يضاهئون قول الذين كفروا من قبل قاتلــهم الله أنى يؤكفــون ﴾ (التوبة: ٣٠)، وە دەفـەرموێ: ﴿ ودوا لو تكفــرون كمــا كفروا فتكونون سوآء.. ﴾ (النساء: ٨٩)، وە دەفـەرمووێ: ﴿ ود كثير من اهل الكتاب لو يردونكم من بعد إيمانكم كفارا ﴾ (البقرة: ١٠٩).

وە زۆر ئایەتی تریش هەن کە دوژمنایـەتی جوولەکـەو گـاور ڕوون دەکەنـەوە بەرامبـەر بەموسـوڵمان، ڕەحمـەتی خوا لە مامۆستای بەرز بێت (سـید قطـب) کـە دەفـەرموێ: (لێ بوردوویی ئیسلام لەگەڵ جولەکـەو گاورەکانـدا شـتێکە ولایەنگیریان شتێکی ترە بەڵام بەداخەوە کە ئەم دووانـە لای هەنــدێ لەموســوڵمانان تێکــەڵاوبووە کەبەتــەواوی

لەڕاستی ئاینی ئیسلام تێنەگەشتوون وەنازانن ئیش‌و ئامانجی ئەم ئاینە چی‌یە بریتی‌یە لە ئاوەدان کردنەوەی‌و دروست کردنی مرۆڤایەتی‌یەکی تەواو بەپێی بیروبۆچوونی ئیسلامی کە جیاوازە لەسروشتی‌دا لەبیروبۆچوونەکانی تر کەمرۆڤ بەگشتی ئەوانەی ئەم ڕاستی‌یەیان لاگۆڕاوە وتێکەڵ بووە لەگەڵ شتی تردا چونکە بیروهۆشێکی زیرەکانەیان نی‌یە دەربارەی سورشتی ئەم شەڕەو سروشتی جولەکەو گاور تیایدا وەئاگایان لەڕێ پێشاندانی قورئان نی‌یە کە چەند جێگە ڕوونی کردۆتەوە بۆ موسوڵمانان، چونکە ئەوان بانگەواز کردنی ئیسلامیان بۆڵی بووردوویی لەمامەڵەکردنی جولەکەو گاوردا کە لەکۆمەڵگای ئیسلامدا دەژین تێکەلاو کردووە لەگەڵ لایەنگیری بۆیان کەلایەنگیری بە تەنها بۆ خواو پێغەمبەرەکەی‌و کۆمەڵی موسوڵمانان دەبی ئەوەیان لەبیرچووە کە قورئان دەفەرموێ کە جولەکەو گاور (أهل الکتاب) هەریەکەیان لایەنگیری ئەوی تریانە لەکاتی جەنگین بەرامبەر موسوڵمان وەئەمە شتێکی پەیوەستە بەوانەوە، وە زۆر ڕقیان لەموسوڵمانێتی و موسوڵمان

دەبێتەوە وبەهێچ شێوەیەك لەموسوڵمان ڕازی نابن تاوەکو وازلــە دینەکــەی خــۆی نــەهێنیٚو دوای دینەکــەی ئــەوان نەکەویٚ.

وەئەوە لەساویلکەیی وبیٚ ئاگایی خۆمانەوەیـە ئەگـەر بێت وابزانین کەئێمەی موسوڵمانو گاوروجولەکەکان (أهـل الکتــاب)یــەك ڕێگــەمان هەیــە بیگرینــە بــەر بەرامبــەر بەکافرەکان و بیٚ بڕویـان بـە پـەروەردگار هەمیـشە ئـەوان لایـەنگیری دوژمنـانی ئیـسلام بـوون وەئـەوەی زۆرسـاکارو ساویلکە بێت دەڵێت: (ئێمە دەتوانین دەست بخەینـە نـاو دەسـتی گـاورو جولەکـەوە بـۆ ڕەوەسـتان بەرامبـەر بـە ماددییەتو بیٚ بڕوایی چونکە دەڵێن: هـەمووومان خـاوەنی دینین) وە ئەوەیان لەبیرچۆتەوە کە قورئان فێری کردوینو ئەوەیان لەبیرچۆتەوە کە دینی ئیسلام چێشتی لەمەدینـەو شامدا بەدەستی (أهل الکتـاب) وە بەتایبـەتی جولەکـەکان وەبوون بە قـەڵغانی بـیٚ باوەڕەکـان لەشـەڕی موسـوڵمانان وەکــافرە کــانی مەککــەوە (اهــل الکتــاب) ئەوانــەن کــە بەموشــریکەکانی مەککــەیان دەوت ئێوەباشــترن لەوانــەی کــەباوەڕیان هێنــاوە بــە (محمــد) (ﷺ). وەك چــۆن

لەقورئاندا بۆیان ڕوون دەكاتـەوە: ﴿ ...هؤلآء اهدى من الذين ءآمنوا سبيلا ﴾ (النساء: ٥١).

وەهەر گاورەكان بوون كە بۆماوەی (٢٠٠ ساڵ) شەڕی صەلیبیان كرد دژی موسـوڵمانان وەهـەر ئەوانـە بـوون كـە ئـەو هـەموو شـتە ناشـرینەیان كـرد دژی موسـوڵمانان لەئەنـدەلوس دا وەهـەر ئـەوان بـوون كەموسـڵمانانیان دەربەدەر كرد لە (حبشە، صوماڵ، ارتیریا) وە هەر ئـەوان بـوون كـە موسـڵمانانیان ئـاوارە كـرد لـە( فلـسطین و ) وەجولەكـەكانیان خـستە شـوێنیانوە زۆر شـوێنی تـریش كەیارمەتی دەری بێ باوەڕیو مادەیی‌یەت وبت پـەرستێتی بوون لە (یوغسلافیا، چین تركستان،..هتـد) وە لەهـەموو شوێنێك لەجیهاندا.

وەئەوانەی وادەزانن لەگەڵ وەهم وبێ ئاگاییاندا) كە دەگونجـێ لایـەنگیری‌و سەرخـستن لـە نێـوان ئێمـەی موسوڵمان‌و گاورو جولەكەدا دروست بێت بـۆ لـەناو بردنـی مادی‌یـەت و بـێ بـاوەڕی بـێ گومـان ئەوانـە قورئـان ناخوێننـەوە، ئەگـەر بیـشی خوێننـەوە ئـەوا بانگـەوازی لێ بووردوویی (سماحة) ئیـسلام تێكـەڵ بەلایـەنگیری (الـولاء)

دەکـەن کـە قورئـان ئاگـاداری کردوینەتـەوە لەلایـەنگیری ئـەهلی کتـاب وەلێـرەدا هـەوڵی ئـەوە ئـەدەن کـە ئـەو جیابوونەوەیـەی کەهەیـە لـەنێوان موسـوڵمانانو وئـەهلی کیتابـدا بتوێتـەوەو نـەیهێڵن بـەناوی لێ بوردوویی‌و لەیـەك نزیك بوونەوەی کەسانی ئاینە ئاسمانی‌یەکان وەئەم جۆرە کەسانە وەك چۆن هەڵەن لەتێگەیشتنی ئاینەکاندا لەهەمان کاتدا هەڵەن لە تێگەشتنی مانای لێ بووردوویی (**التسامح** **أو السماحة**) لە ئیسلامدا.

وە ئەو ئاینەی کەنێردراوەتە خوارەوە بۆسەر (محمد) (ﷺ) هەرئەوە ئاینەلای خوای گەورەو ئەوانەی تـری پـی سـپردراوەتەوە وەلێبـوردوویی (التـسامح) لـە مامەڵـەی کەسایەتی دابێ، نەك لەبۆچوونە بیروباوەڕی‌داو لەیاسای کۆمەڵایەتی‌دا بـەڵام ئەمانـە هـەوڵ ئـەدەن بـۆ توانـەوەو نەهێشتنی ڕاستی مەسـەلەکە لـەناخی موسـوڵماندا لەگـەڵ ئـەوە کـە پـەروەردگار تـەنها دینـی ئیـسلام وەردەگرێـتو پێی ڕازی دەبێت، وەپێویستە لەسـەر موسـوڵمانیش کـە بەرنامەی خوا بچەسپێنێ کەلـەدینی ئیـسلامدا کۆبۆتـەوە، وەجگــە لــەقورئان هــیچ بەرنامەیــەکی ترەوەرنــاگیرێ

وەهــەروەها نابێــت بــەگۆڕانکاری تێیــدا، خــوای گــەورە دەفــەرمووێ: ﴿إن الدين عند الله الإسلام..﴾ (آل عمران: ١٦)، ﴿ومن يبتغ غير الإسلام دينا فلن يقبــل منـــه..﴾ (آل عمران: ٨٥) ﴿...لامبدل لكلمتـــه..﴾ (الكهف: ٤٨) کــەئاینی ئیــسلام هــات بۆئــەوەبوو کــەبیروباوەڕی ئــەهلی کتاب بێ باوەڕو بت پەرستەکان ڕاست بکاتــەوەو بانگــەواز بکات بۆ بیروباوەڕی ڕاستی ئیسلامو هەمووان تاکە ڕێگەی ڕاست بگرنە بـەر بـەڵام لەگـەڵ ئەمـەش دا نابێـت کـە ئـەم بیروبــاوەڕە بــەزۆر بــسەپێنرێ بەســەر خەڵکیــدا چــونکە ئەنجامەکــەی لەکۆتایــدا بــێ بــەردەبێت. [في الظـلال القـرآن (ج١/١٠٩-١١٥) بەدەست کاریيەوە].

## جیاوازی نێوان لایەنگیری وباشی مامەڵەکردن

لەوەپێش ووتمان کەلایەنگیری شتێکە ومامەڵـەکردنی باش شتێکی ترە وەبنــچینەی ئــەم یاسایەش فــەرموودەی پەروەردگارە: ﴿لاينهاكم الله عن الذين لم يقــاتلوكم في الدين ولم يخروجوكم من ديركم أن تـــبرهم وتقـــسطوا

إليهم إن الله يحب المقسطين ﴾ (الممتحنة: ٨)، وەزانایانی تەفسیر لەڕوون کردنەوەی ئەم ئایەتانە چەند ڕایەکیان هەیە، هەندێکیان دەڵێن: مەبەستی پێی ئەوانەن کە باوەڕیان هێناوە و هەر لەمەککەداو کۆچیان نەکردووە لەبەر ئەوە پەروەردگار بە باوەڕداران دەفەرموێ کەباش بن لەگەڵیاندا وە (مجاهد) کەیەکێکە لەزانایانی تەفسیر ئەویش هەر لەسەر ئەم ڕایەیە وەهەندێکی تر دەڵێن مەبەست لەبێ بڕوایانی مەککەیە ئەوانەی شەڕیان لەگەڵ بڕوادارن نەکردووەو لەماڵی خۆیان دەریان نەکردون وەدوای پەروەردگار ئەمەی سڕییەوە (نسخ)یکردووەوفەرمانی پێ دان کەشەڕیان لەگەڵ بکەن وە ئەمەش لە (قتادە)وە دەگێڕنەوە (تفسیر الطبری ٢٨/٦٦) بەلام (إبن جریر) وابە باش دەزانێ کە مەبەستی پەروەردگار پێی گشتییەو هەمووکەسانی ئاینەکانی ترو هەموو کەس و میللەتێکی تریش دەگرێتەوە چونکە فەرموودەی خوای گەورە لێرەدا گشتییەو کەسی جیانەکردۆتەوە کەباش مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت، بەم پێیە (إبن جریر)دەڵێ کەهیچ مانایەك نییە بۆ ئەوەی

کەدەڵێ گوایە لەدوایی‌دا ئەم ئایەتە سڕاوەتەوە (نسخ) وەفرمانی شەڕدراوەلە گەڵیاندا. چونکە باشی بڕوادار لەگەڵ هەر کەسێك بێت ئەگەر لەشەڕیش دابێت حەرام نی‌یەو نەهی لێ نەکراوە ئینجا ئەگەر ئەوکەسە خزم و کەس وناسیاوی بێت یان نەناسراوی بەمەرجێ ئەمە هیچ کارێك نەکاتە سەر هەڵماڵینی پەردە لەسەر نهێنیەکانی موسوڵمانانو بەهێزبوونی دوژمنی تێدا نەبێت بەهەرشێوەیەك بێت وئەوەی کەزیاتر ئەمەمان بۆڕوون بکاتەوە ئەو ڕووداوەیەکە (إبن الزبیر) ڕەزای خوای لێ بێت بۆمان دەگێڕێتەوە لە تفسیری الطبری)یەوە ئیسلام یەم کردوەیەی هەتاوەکو لەکاتی بەر بەرەکانیشدا بێت هەمیشە هۆیەکانی خۆشەویستی دەهێڵێتەوە لەناخدا بەپاکی هەڵسو کەوتو دادوەری هەڵسو کەوت دا چونکە چاوەڕێی ئەو ڕۆژەیە کەلەگەڵ بەر بەرەکانی‌یە کەشدا قەناعەت بکات بەوەی خۆشی‌و چاکە لەوەدایە کە بچێتە ژێر ئالای پیرۆزی ئیسلامەوە وەلە سەرەتای ئەم لێکۆڵینەوەیەدا باس کرا کە پەروەردگار فەرمانی پێ داوین کەسیلەی رەحمان هەبێ لەگەڵ کەسو کاری کافریشدا

بێت وەئەمەش پێی ناوترێ لایەنگیری بۆئەوان وەئێستاش دەگەڕێینەوە بۆ ڕوداوەکەی (اسماء) لەگەڵ دایکیدا کە کچی (أبو بکری الصدیق) ڕەزای خوا لەهەردووکیان بێت (بوخاری ومسلم) بۆمان دەگێڕنەوە لە (اسماء)وە کە دەڵێ دایکم هات بۆلام کەموشریكو بێ باوەڕبوو لەسەر دەمی پێغەمبەردا (ﷺ) وە منیش پرسیارم لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد ووتم: دایکم هاتووە بۆلام بەخۆشی خۆی، ئایا سیلەی رەحمی لەگەڵدا بەجێ بهێنم؟ ئەویش فەرمووی: ((بەڵێ بەجێی بێنە)) [صحیح البخاري /کتاب الهبة/ باب الهدية للمشركين (٥/٢٣٣)حديث (٢٦٢٠) و صحيح مسلم / كتاب الزكاة (٢/٦٩٦) حديث (١٠٠٣)].

وە (الخطابي) دەڵێت: لەم فەرموودەیەوە بۆمان دەردەکەوێ کەسیلەی ڕەحم لەگەڵ کافرەکاندا بەجێ دەهێمرێ لەلایەنی هەرشتێکەوە بێت وەك چۆن هەرکەسێکی تری موسوڵمان سیلەی رەحم لەگەڵدا بەجی هێنرێ وەهەر لەم فەرموودەیەوە وەردەگیرێ کەپێویستە نەفەقەی دایكو باوکی کافر بکێشرێت ئەگەر بێتو کوڕەکەیان موسوڵمانیش بێت [فتح الباري(٥/٢٣٤)]

وه (إبـن حجـر) دهڵێـت: (چـاكه كـردن وهسـيلهى ڕهحـم وباشىمامهڵه كردن پێويستى بهو خۆشهويستى يهنىيه كه خوا نههى لىٚ كردووه لهم ئايهتهدا ﴿ لاتجد قوما يؤمنـــون بالله واليوم الآخر يوادون مـــن حـــآد الله ورســـوله ﴾ (المجادلة: ٢٢) وهئهم فهرمانهش گشتىيه له حهقى ئهوانـهى كـهدژى ئيـسلام شـهڕيان كـردووه يـان نـهيانكردووه) [فـتح الباري (٢٣٣/٥)] وه (إبن القيم) دهڵىٚ: (ئهم ئايهتـه بهڵگهيـه لهسهر پێويستى مهسرهف كێشانى دايكو باوك ئهگهر بێتو ئاينى كوڕو باوكهكـه يـان دايكـه كـهش جياوازبێـت. لهبـهر فهرموودهى خـواى گـهوره: ﴿ ووصينا الإنسان بوالديـــه حملته أمه وهنا على وهن وفصاله في عامين ان شـــكر لي ولوالديك وإلى المصير، وإن جاهدك على أن تـــشرك بي ماليس لك به علم فلا تطعهما وصـــاحبهما في الـــدنيا معروفا واتبع سيبل من أناب إلي ثم إلي مرجعكم فأنبئكم بما كنتم تعملون ﴾ (لقمان: ١٤-١٥).

وهچاكه كردن ئهوهنىيه كه دايكو باوك بهجى بهێڵێن لـــهكاتى پێويـــستىو هـــهژارىو دهســـت كورتىـــدا وهكوڕهكهشى لهوپهڕى دهوڵهمهندىدا بێت وهپهروهردگار

بەخراپ ئەوانە باس دەكات كەسیلەی ڕەحم بەجیٚ ناهێنن وەگەورەیی ئەو تاوانەشمان بۆ باس دەكات وەفرمانی بەجیٚ هێنانیداوە ئەگەر ئەوان كافریش بن خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ ... واتقوا الله الذي تسآلون به والأرحام ﴾ (النساء: ١)، وە لەیەكیٚ لەفەرموودەكانی پێغەمبەردایە (ﷺ) دەفەرموێ: ((لایدخل الجنة قاطع الرحم)) [صحیح البخاري /كتاب الأدب/ باب أثم قاطع رحم (٤١٥/١٠) حدیث (٥٩٨٤)، صحیح مسلم/ كتاب البر وصلة (١٩٤٨١/٤) حدیث (٢٥٥٦)]. وەئەوەی لەم فەرموودەیەدا ڕەچاوبكریٚ ئەوەیە كە ووشەی (قاطع) بەم شێوەی نەناسراو واتە: (نكرة) هاتووە وبەم شێوەیە دەبێتە كارێكی گشتی ومەبەستی چەند كەسێك نییە بەتەنها، سیلەی ڕەحم واجبەو پێویستە ئەگەر بێتو بۆ كافریش بێت چونكە ئەو دینی خۆی وەمنیش دینی خۆم وەهەندیٚ كەس هەن مەسرەف كێشان بەمیراتی پێوانە دەكەن وەئەمەش پێوانەیەكی هەڵەو فاسیدەچونكە بنچینەی میراتی سەرخستن و لایەنگیرییە بەپێچەوانەی مەسرەف كێشانەوەكە بنچینەكە بەیەك گەیاندنو دلٚ دانەوەی

یەکتریەیە کە مافی خزمایەتی لەنێوان کەس و کاردا چونکە ئـەم مافـە خـوای گـەورە بەخـشیویەتی لـەم دنیـا، وەك دەفـەرموێ: ﴿ وأعبـدوا الله ولاتـشركوا بـه شـيئا وبالوالدين إحسانا وبذي القربى واليتـامى والمـساكين والجار ذي القربى والجار الجنب والصاحب بالجنب وابن السبيل وماملكت أيمـانكم.. ﴾ (النساء: ٣٦).وەئەوانـەی کەلـەم ئایەتـەدا بـاس کـراون مـافی ئـەوەیان هەیـە کـە چاکەیان لەگەڵدا بکرێت و بگـرە پێویستە: (بـاوك و دایـك، خـزم و کـەس وکـار ، هـەتیوان، هـەژاران ، دراوسـێ، لێقـەوماوان، خزمـەتکارەکانتان) ئینجـا ئەمـە ئەگـەر هـەرکامێکێك بێـت کـافریش بێـت دەبێـت بـاش مامەڵـەی لەگەڵدا بکرێت، وە لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کەلایەنگیری کەلـە خۆشەویـستی و سەرخـستندا کۆبۆتـەوە شـتێکەو مەسرەف کردن و چاکە کردن و سیلەی ڕەحم بەجی هێنـان لەگـەل خـزم و کـەس و کـاری کـافردا شـتێکی تـرە، وەلێ بوردوی ئیسلام (سماحة الإسلام) دیسانەوە دەردەکـەوێ لەمامەکردنی ئەسیرو پـیرو منـداڵ وئـافرەت لەشـەڕدا وەك ئاشکرایە لەلا پەڕەکانی مێژوو ئیسلامدا.

# هەڵس و کەوت لەگەڵ کافراندا

## ***یەکەم:*** مامەڵەی کڕین و فرۆشتن:

(شيخ الإسلام إبن تيمية) دەڵێ: (هەر لەبنەچەدا هیچ مامەڵە کردنێك حەرام نیيە لەوانەی کە خەڵکی پێویستی پێیەتی تەنها ئەوە نەبێ کەلە قورئان و سوننەتدارِی یان پێ نەدراوەو بەڵگەی لەسەرە بۆ حەرام وەکو چۆن هیچ جۆرە خواپەرستییەك دروست نیيە وحەرامە جگە لەوانە نەبێت کە قورئان وسوننەت ڕێیان پێ داوە . دین ئەوەیە کە خوای گەورە داینـاوە، وە حەرام ئەوەیە کە خوای گەورە حەرامی کردووە بەپێچەوانەی ئەوانەی کە خوای گەورە باسی کردوون بەخراپ چونکە چەند شتێکیان حەرام کردووە کە خوای گەورە حەرامی نەکردووە، وەشەریکیان بۆ خوا قەرارداوە کە خوانەهی لێ کردووە، وە هەروەها دینەکەیان بەئارەزووی خۆیان گۆڕیوە بۆ خەڵکی کە پەروەردگار بەهیچ جۆرێك ڕازی نابێ پێی. (السياسة الشرعية، ص: ١٥٥).

وەبە پێیئەم بنەچەیە لەسەر دەقە شەرعىیەکانو ڕووداوەکانی ژیانی پێغەمبەر (ﷺ) و یارەکانی لە خەلیفەکانی راشیدیو پێشەوایانی ئیسلام دەڵێن: مامەڵە کردن لەگەڵ کافراندا لەکڕینو فرۆشتندا پێی ناوترێت لایەنگیری بەڵکو موسوڵمانان دەتوانن کڕین و فرۆشتن بکەن لەگەڵ کافراندا ئەوەتا (شیخ الإسلام إبن تیمیة) پرسیاری لێ دەکرێ دەربارەی مامەڵە کردن لەگەڵ تەتەردا ئەویش دەڵێت: (بەهەر شێوەیەك مامەڵە کردن بگونجێ لەگەڵ ئەوانەی کەوەك تەتەروان ئەوا دەگونجێ لەگەڵ تەتەرەکانیشدا، وەحەرام بوونەکەش هەر بەهەمان شێوە لەبەر ئەوە موسڵمان دەتوانێت مەڕو ماڵاتیانو کەلو پەلیان لێ بکڕێت وەك چۆن لە عەرەبێك یان تورکمانێك یان کوردێکی دەکڕێت وەهەروەها ئەویش دەتوانێت کەخۆراكو جلو بەرگ وشتی تریان پێ بفرۆشێت، بەڵام ئەگەر شتێکی بەئەوان یان غەیری ئەوان فرۆشت کە یارمەتیان بدات بۆ کردنی ئەوشتانە کەحەرامن ئەوا دروست نیەیە، وەك فرۆشتنی ئەسپو چەكو ئەوانەی کە بۆشەڕ بەکار

بهێنرێت بەئەوکەسانەی کە شەڕ دژی موسڵمانان دەکەنو دژیان دەوەستن خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ ... وتعاونوا على البر والتقوى ولا تعاونوا على الإثم والعدوان ..﴾ (المائدة: ٢) وە ئەو ماڵو سامانەی کە ئەوان هەیانە ئەگەر بزانی کەماڵی خەڵکیەو داگیریان کردوە ئەوا دروست نیە کەبکڕدرێت ئەگەر ئەو کەسە بۆخۆی بێت بەڵام ئەگەر بکڕدرێت بۆ ئەوەی کەبگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکانیان ئەگەر توانرا ئەگینا دەبێ مەسرەف بکرێت بۆبەرژەوەندی موسڵماناندا.

ئەمەیان دروستە بەڵام ئەگەر نەزانرا سەرچاوەی ئەو ماڵە چیە ئەوا دروستە مامەڵەی کڕینو فرۆشتنیان لەگەڵدا بکەین وەك ئەو ماڵەوایە کە لەبازاڕدا هەیە بەڵام دزراوەیان داگیرکراوە وەسەرچاوەکەی نازانرێ) [(المسائل الماردينية، (ص: ١٣٢-١٣٣) تحقيق الشاويش الطبعة:٣ سنة ١٣٩٩هـ)] وە (بوخاری) لە (كتاب البيوع)دا لەباسی کڕین فرۆشتندا لەگەل بێ بڕوایانداو ئەهلی شەڕدا لە (عبد الرحمن ی کوڕی أبی بکر) ەوە ڕەزای خوا لەهەردووکیان

بێت بۆمان دەگێڕنەوەو دەڵێ: (لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) بووین کە پیاوێکی بێ باوەڕ (مشرك) قژدرێژێك بوو هات وکۆمەڵێك مەڕی پێش خۆی دابوو پێغەمبەر (ﷺ) پێی ووت: دەیفرۆشی یان پێش کەشە ئەویش ووتی: نەخێر فرۆشتنە ئەویش مەڕێکی لێ کڕی). [صحیح البخاري (٤/٤١٠) حدیث (٢٢١٦)] وە هەروەها (إبن بطال) دەڵێ: مامەڵە کردن لەگەڵ کافراندا دروستە تەنها ئەو مامەڵەکردنە نەبێت کەپشت ئەستوریان دەکا لەشەڕی دژی موسڵماناندا (فتح الباري ٤/٤١٠) وە ئەوشتانەی کە کافرەکان لەجەژنەکانیاندا بەکاری دێنن وەك (خواردنو جلو بەرگ وبۆن) دروست نی‌یە کە موسڵمان پێیان بفرۆشێت یان پێش کەشیان بکەن چونکە ئەمە جۆرەپشت گرتنێکە بۆیان بۆ بەجێ هێنانی جەژنەکانیان کەحەرامە لەئیسلامدا وە ئەمەش بەپێی بنەچەیەکە (أصل) کەدەڵێ: (دروست نی‌یە کەترێو شەربەت بەکافرەکان بفرۆشرێت بۆ ئەوەی بیکەن بەشەراب یان عەرەق (خمر) وەهەروەها دروست نی‌یە

چەکیشیان پێ بفرۆشرێت بۆشەڕ کردنیان لەگەڵ موسڵماناندا) (إقتضاء الصراط المستقيم، ص: ٢٢٩).

## ***دووەم:*** (وقف) کردنی موسڵمانان لەسەر کافرەکانو (وقف) کردنی ئەوان لەسەر موسڵمانان:

لەسەرەتاوە بازانین (وقف) مانای چی‌یە؟ لەبەر ئەوەی هیچ ووشەیەکی وام نەدۆزی‌یەوە لەزمانی کوردی‌دا کەپڕ بەپێستی ووشەی (وقف) بێت لەبەر ئەوەنا چاربووم کەئەم ووشەیە وەکو خۆی بەعەرەبی بهێڵمە وەئێستاش ڕوون کردنەوەیەکی کەم دەخەمە پێش چاو بۆ زانینی مانای ووشەی (وقف).

(**وقف**) واتە: دانانی ماڵو سامانێك یان خێروقازانجەکەی بۆ کەسێك یان شتێك یان شوێنێکی دیاری کراو لەلایەن خاوەنی ئەو ماڵەوە. (إبن القيم) دەڵێ: (ئەوەی کە کافران (وقف)ی دەکەن، سەیری دەکرێ ئەگەر دایان نابێ بۆ دیاریکراوێك یان لایەك کە خۆیان مەبەستیان بێت ئەوا دروستە بۆ موسڵمانان کە وەقفی

بكات وەك يارمەتى دانى كەم دەستان وهەژاران‌و چاكردنى ڕێگاوبـــان و بەرژەوەنـــدى گـــشتى يـــان كوڕەكانيـــان ونـەوەكانيان، ئـەم جـۆرە وەقفـە ڕاسـتە وهـەروەك ئـەوە وەقفـە وايـە كـە هـەموو موسـڵمانێك بيكـات بۆئەوانـەى كەباسمان كرد بەڵام ئەگەر مـەرجێكى واى دانـابوو لەسـەر كوڕەكـانى وخـزم‌و كـەس بۆئـەوەى كـە وەقفەكـەى بـۆ دابنرێـت وە بڵێـت: دەبـێ موسـڵمان نـەبێت بـەڵام ئەگـەر موسڵمان بن ئەوا وەقفەكەيان دەدەنـێ ئـەم جـۆرە وەقفـە ڕاست نىيەو دروست نىيە كە دادگـا بـەپێى ئەمـە حـوكم بكات بە ڕێكەوتنى ڕاى هەموو پێشەواياني ئيـسلام چـونكە پێچەوانەى بيروبۆچوونى دينى ئيسلامە.

بـەڵام وەقفـى موسـڵمانان لەسـەر كافرەكـان ئـەوا دروسـتە تـا ئەوەنـدەى لەگـەڵ حـوكمى خـواو پێغەمبـەردا (ﷺ) دەگـونجى. وەدروسـتە ئەگـەر موسـڵمانان وەقفـى بكات لەسەر كەسێكى دياريكراو يـان شـوێنێك يـان يـەكێك لەكـەس‌و كارەكـانى خـۆى ئەگـەر كـافريش بـن كەواتـە كافرێتى مەرج نىيە يـان نابێتـە ڕێ گرێـك بـۆ ئـەوەى كـە وەقف لەسەر ئەوكەسەبكرێت يان نا ئەگـەر كـافريش بێـت

ئینجا ئەگەر موسڵمان بوو ئەوا باشترە بۆ ئەوەی کە وەقفی لەسەر بکرێت بەڵام وەقف کردن لەسەر کڵێسەکانیانو ئەوشوێنانەی کە کوفری تێدا فێری شوێن کەتووانیان دەکەن ئەوا دروست نییە چ لەکافرەوەبێت ئەم وەقفە یان لەموسوڵمانەوەبێ چونکە ئەمە ئەو پەڕی یارمەتیدانیکوفرە بەهێزتر دەبن پێی، وەئەمەش لەگەڵ دینی ئیسلامدا ناگونجێ [أحكام أهل الذمة (١/٢٩٩- ٣٠٢) وەسەیری کتێبی (مجموعة الرسائل والمسائل) بکە (١/٢٢٩)].

## سێیەم: چوون بۆلایان لەنەخۆشیدا وپیرۆزبایی لێ کردنیان لە جەژنەکانیاندا:

(أنس ی‌کوڕی مالك) ڕەزای خوای لێ بێت بۆمان دەگێڕێتەوە دەڵێ: کوڕێکی گەنج خزمەتی پێغەمبەری دەکرد (ﷺ) کە جولەکەبوو کەڕەتێکیان نەخۆش کەوت وەپێغەمبەریش (ﷺ) چووبۆلای وەلای سەرییەوە دانیشت وپێی ووت: ((موسڵمان ببە)) ئەویش سەیری باوکی کرد لەوێبوو، باوکیشی پێی ووت: (بەقسەی (أبا قاسم) بکە) ئەویش موسڵمان بوو، پێغەمبەریش (ﷺ)

هاته دەرەوە ووتـی: ((سوپاس بۆ ئەو خوایـەی ڕزگـاری کرد لە ئاگر)) [صحيح البخـاري /كتـاب الجنـائز/ (٢١٩/٣) حـديث (١٣٥٦)].

وەهەروەها مامی پێغەمبـەر (ﷺ) ـ أبـوطالـب ـ کـە خـەریك بـوو دەمـرد پێغەمبـەر(ﷺ) چـوو بـۆلای و پـێی ووت : ((کــە موســڵمان ببێــت)) [صـحيح البخــاری /کتــاب الجنائز/٣/٢٢٢حديپ(١٣٦٠)] وە (إبن بطـال) دەڵـێ: (دروسـتە ئەگـەر موسـڵمان بـچێت بـۆلای کـافرێکی نـەخۆش ئەگـەر چـاوەڕوانی ئـەوەی لێ بکرێـت کـە موسـڵمان بێـت، بـەڵام ئەگەر چـاوەڕوانی ئـەوەی لێ نـەکرێت ئـەوا دروسـت نی‌یـە بــەڵام ئەمــە ئەوانــە ناگرێتــەوە کــەمافی دراوســێیەتی‌و خزمایـەتیان هەیـە. وەك ئـەوەی کەدەردەکـەوێ لەقـسەی (إبن حجر)دا ئەوەیە کـە ئەوبەسـەر کردنەوەیـەیان لـەکاتی نەخۆشی‌دا دەگۆڕێ بەپێی مەبەستی بەسەر کردنەوەکـە) (فتح الباري ١١٩/١٠).

بـەڵام پیرۆزبـایی کردنـی کافرەکـان لەجەژنـەکانیان‌و بۆنەی کوفردا کەتایبەتـە بـە خۆیانـەوە حەرامـەو دروسـت نی‌یــە لەســەر قــسەی هــەمووان وەك بڵێــت: (**جـەژنتان**

**پیرۆزبێت یان بڵێت هەرخۆش بێت ئەم جەژنەتان )** وەك ئەمە لەحەرامی دادەگاتە پلەی ئەوەی کە کڕنوش بۆ خاچ (صلیب) بەرێت بگرە جەژنە پیرۆزییەکە زۆر تاوانی گەورەترە لەلای پەروەردگار وەهەروەها تاوانێکی گەورترە لەخواردنەوەی عەرەقو کوشتنو زیناکردن. وەزۆر هەن کەڕێزو نرخی دینەکە نازانن دەکەونە ئەم هەڵەیەوەو نازانن هەڵەیەکی چەند گەورەیان کردووە. وەهەرکەس پیرۆزبایییەك لەیەکێك بکات بۆ بێ فرمانی یەکێخوا یان تازەگەرییەك (بدعة) لەدیندا یان کوفرکردن بەخوا ئەوا تووشی سزاو تورەیی پەروەردگار دەبێ. وەزانایانی دین کە دووربوون لەخراپەکاری بەهیچ شێوەیەك پیرۆزبایی یان لەکاربەدەستەستەم کارەکان نەدەکردو هەروەها ئەوانەی کە خۆیان بەدادپەروەرو موفتی دەزانن ولەگەڵ ئەوەشدا نەزان بوون بەهیچ شێوەیەك پیرۆزبایی یان لێ نەدەکردن بۆ ئەوەی بەر تووڕەیی خوای گەورە نەکەوون.

(بەڵام ئەگەر موسڵمانان زانی کەلە لەوانەیە توشی گیروگرفت بێت لێیانەوە ئەوا دەتوانێت بچێت بۆلایان وە هیوای خۆشیان بۆ بخوازی بۆ ئەوەی لەشەڕیان بەدووربێ)

[أحكام أهل الذمة لإبن القيم (١/٢٠٥-٢٠٦)] بەهەمان شێوە دروست نی‌یە کافرەکان بەگەورە دابنێن وەپی‌یان بڵێن (کاك فلان کەس) یان (گەورەم) چونکە بەم کردەوەیە خوای گەورە لەخۆتان توورە دەکەن. لەفەرموودەیەکی پێغەمبەردا (ﷺ) هەیە کە پلەی (مرفوع)ی هەیە: ((لاتقولوا للمنافق سيد فإنه إن يك سيدا فقد اسخطتم ربكم عزوجل)) [سنن أبي داود كتاب الأدب (٥/٢٥٧) حديث (٤٩٧٧) وقال الألباني إسناده صحيح]..واتە: بەدووڕوو مەڵێن کاك یان گەورەم چونکە ئەگەر گەورە بێت ئەوا خواتان لە خۆتان ڕەنجان.

وە دروست نی‌یە لەقەبی گەورەی وڵات یان پیاوچاك بدرێتە پاڵیان وەهەر کاتێکیان لەقەبێکی وای لەخۆی نا ئەوا نابێت موسڵمان بەو لەقەبەیان بەوناوە بانگی بکات.

وەدوای ئەوە (إبن القيم) لەدەقی فەرموودەیەکدا دەڵێ: (..بەڵام ئێستا لەرۆژێکدایین کە ئەوان لای سەرەوەی کەمەجلیس دەگرن‌و خەڵکی هەڵدەستێ لەبەریان وەدەستیان ماچ دەکەن وەدەستیان گرتوە بەسەر ڕۆژی ئەو خەڵکەداو فەرمانڕەوایی بەدەست ئەوانە،

وەکونیەی وەك (ابو العلاء، ابو الفضل ، ابـو الطيـب) يـان لـەخۆيان نـاوە ناويـان گۆڕیيەوەبـە (حـسن ، حـسين، عثمان، علی) وە لەوەپێش ناويان (يوحنا، متی، جـرجس، بطرس، عزرا، اشعيا حزقيـل، حيـی ) بـووە، بـەڵام هـەموو سەردەمێك دەوڵەت وپياوی خـۆی هەيـە) [أحكـام أهـل الذمـة (٧٧١/٢)].

وەئەگەر ئەمە قسەی زانای بەناويانگ (إبن القيم) بێت كەساڵی (٧٥١هـ) كۆچیدوايی كردووە ڕەحمـەتی خـوای لێ بێت دەبا ئەمڕۆ موسڵمانان سەيری ئەو تێكەڵاوبونـە بكـات گەڵێی تێكەڵ بووە وەك ئاوی چۆڕاوگە بەحيـسای خۆيـان موسـڵمانن بـەڵام شـوێن دوژمنـانی خـوا كـەتون لەهـەموو گەورەو بچوكێكدا بەڵام چۆن شوێن كەوتنێك؟! زۆر زۆربـە شـانازی يـەوە، وە هــەر بۆنەيـەك يـان جـەژنێك بەسـەر دوژمنـانی ئيـسلامدا بێـت لەهــەر كوچـەوكۆڵانێكدا بێـت يەكـسەر پيرۆزبـايیو پیخۆشـحاڵی خۆيـان دەردەبـڕن بۆيان!.

## چوارەم: سڵاوکردن لێیان

ڕای زانایـان جیـاوازە لـەواتای فـەرموودەی خـوای گـەورە کـە (إبـراهیم) سـڵاوی خـوای لێ بێـت بـاوکی بـانگ کردووە بۆڕێگاری ڕاست ئەویش ڕازی نەبووە ئەویش پێی ووتووە: ﴿ ..سلام عليك.. ﴾ (مريم: ٤٧) بەڵام موسـڵمانان بەگشتی دەڵێن: (مەبەست پێی دڵنیایی مەسـەلەیەکە کـە چوونە سەرڕێگای ڕاستە نەك مەبەست پێی سڵاو کردن بێت).

بـەڵام (طـبري) دەڵـێ: واتـای دڵنیـان بـوون لەمنـەوە بۆتۆ، وەلەسەر ئەمە موسڵمان یەکـەم جـار نابێـت سـڵاولە کـافر بکـات) (تفسير القـرطبي ١١/١١١-١١٢) وەهەنـدێکی تـر دەڵێن لەواتای سڵاوەکە ئیبراهیمدا (سـڵاوی لەیـەك دابـڕان بووە) وە پرسیار لە (إبن عيينة) کرا ئایا دەگونجـێ سـڵاو لـەکافر بکـرێ؟ ئـەویش ووتـی: بـەڵێ خـوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿ لاينهاكم الله عن الذين لم يقتلـوكم في الدين ولم يخرجوكم من ديركم ان تـبروهم وتقـسطوا إليهم.. ﴾ (الممتحنة: ٨) وە ئیبراهیمیش بەباوکی ووتـوە: ﴿ سلام عليك ﴾. وە (قرطبي) دەڵێ: (دەڵێم کـە: ڕاسـت تـر ئەوەیـە لـەواتای ئایەتەکـەدا کـە (سـفيان بـن عيينـە) ووتوویەتی) (تفسير القرطبى ١١/١١١-١١٢) وەلـەم بـوارەش دا

دووفـەرموودەی پێغەمبـەر (ﷺ) هەیـە یەکـەمیان: (أبـو هریـرة) ڕەزای خـوای لێ بێـت بۆمـان دەگێڕێتـەوە لـە پێغەمبـەر (ﷺ) کەفەرموویـەتی: ((لا تبـدؤا الیهـود والنـصاری بالـسلام فـإذا لقیـتم أحـدهم في الطریـق فاضطروه الی أضـیقه)) [صحیح مسلم ج(١٧٠٧/٤)]. واتـە : دەست پێش خەری سـڵاو مەکـەن لـە جولەکـەو گاورەکـان وەئەگـەر لـەڕێگادا گەیـشتن بەیـەکێکیان ئـەوا بیترنجێننـە تەنگەبەریەوە ناچاری بکەن بچێتە تەسکاییەکەوە

کەواتە ئەمە بەڵگەیـە بـۆ دەسـت پـێ نـەکردنی سـڵاو لەجوولەکەو گاور، بـەڵام ئەگـەر سـڵاویان لێ کـردین دەبـێ وەڵامیان بدەینەوە. وەفەرموودەی دوومیان لە (أسامة بـن زیـد)ەوە ڕەزای خـوای لێ بێـت ((أن الـنبي (ﷺ) رکـب حمـارا علیـه إکـاف تحتـه قطیفـة فرکبـه وأردف وراءه اسامة بن زید وهو یعود سعد بن عبادة في بنی الحرث بن الخزرج وذلك قبـل وقعـة بـدر، حتـی مـر في مجلـس فیـه إخلاط من المسلمین والمشرکین عبدة الأوثـان،والیهود و فیهم عبد الله ابن أبي بن سلول وفي المجلـس عبـدالله بـن رواحة فلما عشیت المجلس عجاجه الدابـة، خمـر عبـدالله

بن ابي أنفه بردائه ثم قال: لاتغبروا علينا، فسلم علـيهم الـنبي (ﷺ))) [صـحيح البخـاري :كتـاب الأسـتئذان (٣٨/١١) حديث (٦٢٥٤) و صـحيح مـسلم / الجهـاد (١٤٢٢/٣) حـديث ١٧٩٨)]

واته:پێغەمبەر(ﷺ) سواری گوێدرێژێك بوو كە كۆپـانێكی بەسـەرەوە بـوو لەژێریـدا پارچـە قوماشـێك بەسـەریەوە لەدوای خۆیەوە ئوسامەی كوڕی زەیدی سوار كرد وەنیازی سـەردانی سـەعدی كـوڕی عوبـادە بـوو لەنـەوەی حـەرپی كوڕی خەزرەج ئەمـەش لـەپێش روودانـی بـەدر ،هـەتا دای بـەلای مەجلیـسێكدا كـە تێكـەڵاو بـوو لەموسـڵمانان و موشـریكینی بـت پەرسـت و جولەكـە و عبـدالله ی كـوڕی ئوبەی كوڕی سەلولیان لـەناودا بـوو ، وە لەمەجلیسەكەدا ععبـد الله ی كـوڕی ڕەواحـەی تێـدابوو ، كاتـێ تـۆزی وڵاخەكـەی دای بـەلای مەجلیـسەكەدا عبـد الله ی كـوڕی ئوبەی لووتی خۆی داپۆشی بەپۆشاكەكەیی و پاشان ووتی : تۆز مەكەن بەسەرماندا . پێغەمبەریش (ﷺ) سـڵاوی لێ كردن .

وەئەمەشیان بەڵگەیە لەسەر ئەوەی سڵاویان لێ بکەین و(قرطبي)دەڵێ : ئەم فەرموودەیەی یەکەمیان بەڵگەیە بۆ ئەوەی‌نابێت یەکەم جار سڵاویان لێ بکەین چونکە ئەوە ڕێز لێ‌گرتنێکەو کافر شایەنی ئەوەنی‌یە. بەڵام دووەمیان دەگونجێ یەکەم جار سڵاویان لێ بکەین) بەڵام (طبری)دەڵێ ئەوەی کە (ابو هریرة) ڕەزای خوای لێ بێت و (اسامة بن زید) ڕەزای خوای لێ بێت دەیگێڕنەوە دژی یەك نین چونکە ئەوەی (ابو هریرة) دەیگێڕێتەوە مەبەست پێ‌ی گشتی‌یە بەلام ئەوەی کە (أسامە) دەیگێڕێتەوە مەبەست پێ‌ی تایبەتە. بەڵام (النخعي) دەڵێ: ئەگەر پێویستت بەشتێك هەبوولای گاورێك یان جولەکەیەك ئەوا تۆ یەکەم جار سڵاوی لێ بکە (تفسیر القرطبي ١١/١١١).

بەم شێوەیە دەردەکەوێت لەگێڕانەوەکەی (ابو هریرة): ((لاتبدؤهم بالسلام)) ئەگەر بەبێ هیچ هۆیەك بێت، جگە لەمافی هاوڕێ‌یەتی وسەفەرو دراوسی‌یەتی‌و چەند شتێکی‌تر.

(الطـبري) دەڵـێ: دەگێڕنـەوە لـەزانا موسـڵمانەکانی کۆنەوە کەسڵاویان لەجولەکەو گاورو کردووە، یەکێ لەوانە (إبـن مـسعود)بـووە ڕەزای خـوای لێ بێـت ، وەهـەروەها (الأوزاعي) دەڵێ: ئەگەر تۆ لەسـەرەتاوە سـڵاوبکەیت ئـەوا پیاوچاکانی پێش ئێمە کردوویانـە وە ئەگـەر نەشـی کـەیت ئـەوا پیاوچـاکانی پـێش ئێمـە نـەیانکردووە، وەلـە (حـسن البـصري)یـەوە دەگێڕنـەوە کـە ووتوویـەتی: ئەگـەر بـەلای مەجلێسکدا ڕۆیشتیت موسڵمانو کافریش تێکـەڵاوبوو ئـەوا سـڵاویان لێ بکـە) (تفـسير القـرطبي ١١٢/١١) وە (إبـن القـيم) دەڵێ: (ئـەوەی کـەدەڵێ یەکـەم جـار دروسـتە سـڵاویان لێ بکەیت دەبێ بڵـی (الـسلام عليـك) بەشـێوەیەکی تـاك نـەك بەکۆ، وەنابـێ بڵـێ: (الـسلام علـيكم) یـان (الـسلام علـيكم ورحمة الله وبركاته) (زاد المعـاد ٤٢٥/٢) بەڵام وەڵام دانـەوەی سڵاوەکانیان رەئی زانایان جیـاوازە لـەوەی ئایـا پێویـستە وەڵام بدرێتـەوە وەیـان نـا؟ موسـڵمانان بەگـشتی دەڵـێن: پێویــستە وەڵامیــان بدرێتــەوە وەو ئــەویش بریتیـیــە لەڕاسـتییەکەی. وەهەنـدێکی تـر دەڵـێن: نابـێ وەڵامیـان

بدرێتەوە وەك چۆن وەڵامی ئەوانە نادرێتەوە کەشتی تازە دێننە ناو دینەوە.

وەجیاوازی گاورو جولەکەکان لەگەڵ ئەو موسڵمانەی کەتازەگەری دەکات لەدیندا ئەوەیە کە گاورو جولەکە خۆمانیان لێ دانا بڕین بەڵام ئەوانی تر کەخاوەن (بدعة)ەن خۆمانیان لێ دادەبڕین بۆ ئاگادار کردنەوەیان لەوازهێنانی ئەو ئیشە (زاد المعاد ٢/٤٢٥).

وەئەوەی زیاتر رەئی موسڵمانان دەچەسپێنێ لەوەڵام دانەوەیاندا فەرموودەی پێغەمبەرە (ﷺ) ((إذا سلم عليكم اليهود فإنما يقول أحدهم السام عليكم فقل وعليك)) [صحيح البخاري /كتاب الأستئذان (٤٢/١١) حديث (٦٢٥٧) و صحيح مسلم في السلام (١٧٠٦/٤) حديث (٢١٦٤)].. واتە: ئەگەر جولەکەکان سڵاویان لێ کردن ئەوا بزانن کە دەڵێن: (مردن بۆ ئێوە) ئێوەش بڵێن وەلەسەر خۆت بێ.

وەفەرموودەیەکی تریش دەفەرموێت: ((إذا سلم عليكم أهل الكتاب فقولوا: وعليكم)) [صحيح البخاري /كتاب الأستئذان (٤٢/١١) حديث (٦٢٥٨) وصحيح مسلم في السلام

(١٧٠٥/٤) حـديث (٢١٦٣)] ..واتــه: ئەگــەر گــاورو جولەكــە سەلاميان لىٚ كردن ئێوەش لەوەڵامدا بڵێن: لەئێوەش بێت.

وآخر دعوانا أن ألحمد لله رب العالمين